# گوڵستانی کتێب

ناوی کتێب: ژیان فێری کردم

ئامادەکردنو وەرگێڕانی: بەرزان ئەبوبەکر

دیزاین: گۆڤاری بڕیار

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

نۆبەی چاپ: سێیەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٦

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردن «١٠٦٢»ی ساڵی «٢٠١٦»ی پێدراوە.

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی

خۆشەویستان ئەم کتێبەی بەردەستتان کۆی هەردوو بەرگی (ژیان فێری کردم)ە، لە دوو تونێ چاپێکی نوێو ڕازاوەدا..

دوای ئەوەی کە بەرگی یەکەم دووجار بە تیراژی (٢٠٠٠) دانە چاپ کـــراو بەرگی دووەمیش بە هەمان تیراژ چاپی یەکەمی ئەنجامدراو هـــەردوو بەرگەکەش دوای پێشـــوازییەکی گەرمی ئێوەی بەڕێز لە کتێبخانەکاندا نەمان.

خۆشەویســـتیمان بۆ کتێبو خوێندنەوەی ئێوەی خوێنەرانی بەڕێز، وای لێکردین هەمیشـــە هـــەوڵ بدەین بە جوانتریـــن چاپو دیزاین، بەرهەمە ناوازەکانی بڕیارتان پێشکەش بکەین..

لەگەڵ بڕیاردا.. هەمیشە وتەی جوانو پەیامی بەرزو چاپو دیزاینی قەشەنگ، میوانی ماڵەکانتانە.

هەر شادو سەرکەوتووبن.

بەرزان ئەبوبەکر

٢٠١٦/١/١٤

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی / بەرگی یەکەم

ئەم بەرهەمەی بەردەستت، وتەی ناودارانو سەرکەوتووانو شارەزایانو پسپۆرانە لەسەر ئاستی جیهان، ئەزموونو شارەزایی کەسانێکە کە گەشبینو سەرکەوتوو بوون لەم ژیانـــەدا، پەرتووکی ژیان فێری کردم، زۆر پێویســـتە لە کتێبخانەی هەموو خوێنەرو ڕۆشـــنبیرێکدا هەبێت، بە تایبەت ئەو کەسانەی، شەیدای بواری گەشەپێدانو هاندانو سەرکەوتنن.

* وتەکانی ئەم پەرتووکە، شایەنی ئەوەن لەسەر بەرد بنەخشێنرێن، تا بۆ هەمیشە لە بیرو هزرماندا بمێننەوە.

* پێویستە لانی کەم مانگی جارێك ئەم پەرتووکە بخوێنینەوە، چونکە هەر یەك لە پەندو وتەکانی، تایبەتن بە واقیعی ژیانی هەموو تاکێکی کۆمەڵگە..

* ئـــەم پەرتووکە، فێرمان دەکات گەشـــبین بین، ســـەرکەوتوو بین، لە شکست نەترســـین، لە هەوڵدانو کۆششکردن بەردەوام بین، بە چاوی هیواوە بـــۆ ئاواتەکانمان بڕوانین.. ئەمانەو چەندیـــن ئەزموونی دیکە لەم پەرتووکە نایابەدا بخوێنەرەوە...

لـــە کۆتاییدا هیواداریـن توانیبێتمان، مەڵۆیەك بخەینە ســـەر کتێبخانەی کوردیو پشوویەکمان بە ڕۆحتان بەخشیبێت.

بەرزان ئەبوبەکر

٢٠١٢/٣/٢٨

پڕۆژەی خوێندنەوە بۆ هەمووان
زنجیرە کتێبەکانی بڕیار (٣)

بەرگی دووەم

# ژیان فێری کردم



بەرزان نەبوبەکر

2014

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی/ بەرگی دووەم

خوێنەری ئەزیز.. ئەم بەرهەمەی بەردەستت «ژیان فێری کردم» گوڵبژێری وتەی بە نرخی کەسانی حەکیمو ناودارانو ئەزموونداران و سەرکەوتووانو پسپۆرانی جیهانە.. ئەزموونی هەموو ئەو کەسانەن کە لە ژیاندا گەشبینو سەرکەوتووبوون..

* «ژیان فێری کردم» کۆمەڵێک وانەی بەنرخو چەندین پەندی جیهانی لەخۆگرتووە.. گەر بە گوێی دڵ گوێیان بۆ ڕادێریت، وانەی زۆر بەسوودی لێوە فێردەبیت.. دەتوانیت وانەو پەندەکانی ئەم پەرتووکە، بکەیتە مەشخەڵی ڕووناکی، بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگە تاریکەکانی ژیان..

* «ژیان فێری کردم» قوتابخانەیەکە فێری بەرخوودانو کۆڵنەدانو بەردەوامیمان دەکات، فێرمان دەکات گەشبین بین، بەختەوەر بین، کۆڵکو تەباو برا بین.. ئەمانەو چەندین وانەی دیکە لەم پەرتووکە نایابەوە فێردەبین..

* «ژیان فێری کردم» جوانترین دیاریو خەڵاتە، بۆ شەیدایانو ڕێبوارانی ڕێگەی سەرکەوتن..

بەو هیوایەی توانیبێتمان، مەڵۆیەکی دیکەمان خستبێتە سەرخەرمانی کتێبخانەی کوردیو پشوویەکمان بە ڕۆحتان بەخشیبێت..

بەرزان ئەبوبەکر

٢٠١٤/٣/١٢


ژیان فێری کردم
ژیـــان قوتابخانەیەکی گەورەیە
گەر مرۆڤ بیەویت وانەی زۆر بە
سوودی لێوە فێردەبێت. ئەم کتێبەی
بەردەستت، کۆمەڵێك وانەی بەنرخی
ئەو قوتابخانەیەن..
پێویســـتە بە گوێی دل، گوێیان بۆ
رادێرین.. تا بیکەین بە مەشخەلی رێ،
بۆ ژیانی ئەم سەردەمە دژوارو ئاڵۆزە..

# ژیان فێری کردم

لە قوتابخانە، یان لە زانکۆ سەرەتا فێری وانەکان دەبین، پاشان ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە دەبینەوە، بەڵام لە ژیاندا سەرەتا ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە دەبینەوە، پاشان فێری وانەکان دەبین.



لە ئەندێرا غاندییەوە زۆر شـــت فێربووم، بۆ نموونە کاتێک دەڵێت:

«باپیرم فێری کردم کە مرۆڤ دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: ئەو کەســـەیە کە هەڵدەســـتێ بـــە کارکردنو ئەنجامی دەدات.

جۆری دووەم: ئەو کەسەیە کە ڕێزو سوپاسی پێدەگات. باپیرم داوای لێکردم، کە من لە جۆری یەکەم بم، لەبەرئەوەی لێرەدا کێبەرکێ زۆر کەمترە».

## ژیان فێری کردم

زۆربـــەی ئـــەو کەســـانەی ئازارمـــان دەدەن، ئەوانەن کـــە هەموو متمانەیەکمان پێبەخشـــیون، لەبەرئـــەوەی نهێنییەکانمان دەزانن، کاتێک کێشەیەک دەکەوێتە نێوانمانەوە، لە دژمان بە کاری دەهێنن، بە دڵنیاییەوە ئەمەش جۆرێکە لە ناپاکی!

## ژیان فێری کردم

ئەو کەســـەی لە ســـاڵێکدا داهاتەکەی «١» ملیۆن دۆلارە، هەزار ئەوەندەی ئەو کەسە کار ناکات، کە لە ساڵێکدا داهاتەکەی «١٠٠٠» دۆلارە، بەڵکو ئەو نهێنییە، لە چۆنییەتی کارکردنی بیروهۆشیدایە.



لە ڕۆس پیرۆوە فێربووم، کاتێک دەڵێت: بیربکەرەوە!

ژیان وەکو یاری بۆکسێن وایە، گرنگ نییە کە «١٤» جار بدۆڕێیت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە، لە ماوەی چەند چرکەیەکدا بە لێدانێکی کوشندە، بەرامبەرەکەت بخەیت، بەمەش دەبیتە براوەی یەکەم.

## ژیان فێری کردم

پێویستە مرۆڤ لە کە سانی «بێتاقەت، ڕەشبین، خراپ، ڕووخێنەر، ڕژد،...» خۆی دووربخاتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت سەرکەوتن بە دەست بهێنێت. چونکە ئەو سیفەتانە، وەکو کۆلێرا لە نەخۆشییە درمەکانن، دەگوێزرێنەوە. کەواتە خۆتان لەو جۆرە کەسانە دووربخەنەوە، بۆ ئەوەی تووشی هەمان نەخۆشی نەبن.

## ژیان فێری کردم

مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی، تۆ بەرپرسو بەڕێوبەریانی، وەکو: «فەرمانبەران، منداڵەکانت،...» وەکو ئەو کەسە وایە کە چۆلەکەیەکی لەناو دەستدایە، ئەگەر دەستی توند بکات، چۆلەکەکە دەخنکێت، ئەگەر دەستیشی والا بکات چۆلەکەکە دەفڕێت، بەوەش کۆنترۆڵت لە دەست دەچێت.




ژیـــری وەکو کێڵگەیەك وایە، هەموو بیرکردنەوەیەك کە بیری لێدەکەیتەوە بۆ ماوەیەکـــی زۆر، وەکو کرداری ئاودانە، تەنها ئەوە دەدوورینەوە کە چاندومانە.




لە هەزاردی سێیەمدا، زانست بەهێز ناژمێردرێت، بەڵکو پراکتیزەکردنی زانست، بریتییە لە هێز.




هیچ ڕۆژێک بە سەرمدا تێنەپەڕێت، لانی کەم ستایشی سێ کەس لە دۆستانو هاوڕێکانمی تێدا بکەم.

## ژیان فێری کردم

ئەوەی دەیخۆین تەندروستمان ناکات، بەڵکو ئەوەی هەرسی دەکەین تەندروستمان دەکات، ئەوەی فێری دەبینو دەیخوێنین نامان کات بە دانا، بەڵکو ئەوەی لە یادمان ناچێت دەمان کات بە دانا، ئەوەی قازانجی لێدەکەین دەوڵەمەندمان ناکات، ئەوەی پاشەکەوتی دەکەین دەوڵەمەندمان دەکات.




قسەکردنێکی کەمو ئاسان، یان گفتوگۆیەکی کورتو پوخت، لەگەڵ کەسێکی دانا، بە ئەندازەی مانگێک خوێندنە.




دووجۆر مرۆڤ هەیە:

یەکەمیان: ئەو کەسەیە کە ماندوو دەبێو بەرهەم دەهێنێت، هەوڵ دەدات بۆ هێنانەدی خواستو ئاواتەکانی، هەمیشە دەیەوێت خۆیو دەوروبەری ئاسوودە بکات، ئەمەش کارێکی ئاسان نییە، هەر بۆیە کەمێك لە خەڵکی لەم جۆرەن.

دووەمیان: مرۆڤێکی بەخیلو حەسوودە، ئیرەیی بە جۆری یەکەم دەباتو هەمیشە وا دەزانێت قسەی باقو بریقەدار چارەسەرە، ڕەخنە دەگرێت لەو کەسەی سەردەکەوێت. ئەمەش ئاسانە، بە هەموو کەس دەکرێت!

## ژیان فێری کردم

هیواو ئاواتەکان، بەبێ دەردەسەریو ماندووبوون، بە دەست نایەن.




کاتێك مرۆڤ دەیەوێت دەوروبەرەکەی بگۆڕێت، پێویستە سەرەتا خۆی بگۆڕێت.






شکستخواردووەکان دوو بەشن:

بەشێکیان بیر دەکەنەوەو کارناکەن.

بەشەکەی تریان کاردەکەنو بیرناکەنەوە!

ژیان فێری کردم

لە کۆتاییدا هەر ئەو کەسە سەردەکەوێت، کە توانای خۆڕاگریو

ئارامگرتنی هەیە!



# ژیان فێری کردم

جوانترین هەستەکانت، بریتییە لەوەی تۆ لە ناختدا هەست بکەیت، هەنگاوێکی ڕاستو دروستت ناوە، ئەگەرچی هەموو جیهانیش دژایەتیت بکەن.



## ژیان فێری کردم

گەورەترین هەڵــە کە مرۆڤ تێی دەکەوێت، ئەوەیە کە خۆی بە هەڵە نازانێت.

## ژیان فێری کردم

بەبــێ ڕەزامەندی خۆمان، هیچ کەس ناتوانێت هەســتمان بریندار بکات.

## ژیان فێری کردم

کاتێک مرۆڤ بیرۆکەیەک دەچێنێت، کارێک دەدوورێتەوە، ئەگەر نەریتێک بچێنێت، هەڵسوکەوتێک دەدوورێتەوە، ئەگەر هەڵسوکەوتێک بچێنێت، ڕێزو خۆشەویستی دەدوورێتەوە.

## ژیان فێری کردم

کاتێک مرۆڤ تووشــی گرفتێک دەبێت، پێویستە هەرگیز نەڵێت: «گرفتێکی ســەختە»، چونکە ئەگەر سەخت نەبێت، پێی ناوترێت «گرفت».




زۆرێك لە خەڵكی ئامۆژگاری دەكرێن، بەڵام كەمێكیان سوودی لێدەبینن!

## ژیان فێری کردم

كاتێك كەسانی زیرەك دەخەیتە كار، دەگەیتە هیوا و ئامانجەكانت، بەوش دەیسەلمێنیت كە تۆ لەوان زیرەكتری!

## ژیان فێری کردم

تاكە ڕێگە بۆ ئەوەی بزانم تا كوێ دەتوانم بڕۆم، ئەوەیە كە تا ئەوپەڕی ڕێگە بڕۆم!

## ژیان فێری کردم

پێویستە مرۆڤ، ئەو بەهرانە بژمێرێت كە خاوەنییەتی، نەك ئەو بەهرانەی كە نییەتی.

## ژیان فێری کردم

ناوبانگی باش، ئەو سەروەتە گەورەو بە نرخەیە، كە پێویستە هەمیشە پارێزگاری لێبكرێت.



# ژیان فێری کردم

زۆربەی کات سەرکەوتن لە ئەنجامی بڕیاردانی ڕاستو دروستەوەیە، بڕیاردانی ڕاستو دروستیش، سەرەنجامی شارەزایی‌و لێهاتوییە، لێهاتوویی‌و شارەزاییش، لە بڕیارە هەڵەکانەوە فێردەبین!



## ژیان فێری کردم

ئەگەر ویستت ڕەخنە لە هاوڕێیەکت بگریت، بە پەنهانی ڕەخنەی لێبگرە، بەڵام ئەگەر ویستت ستایشی بکەیت، پێویستە بە ئاشکراو لەبەرچاوی هاوڕێو هاوکارانت، ستایشی بکەیت.

## ژیان فێری کردم

دروستکرنی متمانە کاتێکی زۆری دەوێت، بەڵام ڕووخانی تەنها چەند چرکەیەکی کەمی دەوێت!

## ژیان فێری کردم

دەفرەکان، ئەوە دەبەخشن کە تێیاندایە!




هەرچەندە هەوڵ بدەیت تا گرنگی بە هەندێك كەس بدەیت، ئەو كەسانە لە بەرامبەردا ئەو گرنگییەت پێنادەن. چونكە مرۆڤ ناتوانێت خەڵكی ناچار بكات خۆشیان بووێت، بەڵام دەتوانێت لە ڕێگای كاری باشو ئاكاری جوانەوە، ببێتە كەسێكی خۆشەویستو ڕۆح سوك.

## ژیان فێری کردم

هەرگیز ناتوانیت قەناعەت بە هەموو خەڵكی بكەیت، هەرچەندە كەسێكی بە ئەزموونیش بیت.




هەموو مرۆڤێك شێوازێكی تایبەتی خۆی هەیە لە ژیاندا، بەڵام دەتوانیت «١٠» كەس فێری شێوازەكانی چێشتلێنان بكەیت، كە هەریەك لەوانیش ئەنجامێكی جیاوازو تاموچێژێكی جیاوازت پێببەخشن.




ئەو كەسەی هەمیشە ڕەخنە دەگرێت، بەڵگەیە لەسەر هەستكردن بە ترسو خۆبەكەمزانینی!

## ژیان فێری کردم

كاتێك مرۆڤ ژیانی خاڵی دەبێت لە شكست، كەواتە وەكو پێویست هەوڵی نەداوە.

## ژیان فێری کردم

كەسانێك هەن زۆر ئەستەمە بتوانیت ڕازییان بكەیت، ئەگەر «١٠٠٠» مۆم دابگیرسێنیت، پێت دەڵێن: ئەی كوا مۆمی ژمارە «١٠٠١» هەزارو یەك؟ خۆ ئەگەر «١٠٠٠٠٠٠» یەك ملیۆن مۆم دابگیرسێنیت، پێت دەڵێن: كوا مۆمی ژمارە «١٠٠٠٠٠١» یەك ملیۆنو یەك... هتد.




باشترین ڕێگە بۆ فێربوون، بریتییە لە فێرکردن.




هیچ مرۆڤێك كامڵ و تەواو نییە، لە پێش هەموو كەسەوە منو تۆ!




مـــرۆڤ هەرگیـــز ناتوانێت بە بـــێ خەڵكی ژیـــان بگوزەرێنێت، هەرچەندە كەسێكی سەركەوتووش بێت.




ســـەركەوتن «١٠٠٠» هاوڕێ و هاوبەشی هەیە، هەر كات مرۆڤ لە كاردكانیدا ســـەركەوتنی بەدەســـتهێنا، زۆرێك لە خەڵكی بۆ لای دەگەڕێنەوەو لە دەوری كۆدەبنەوە، بەڵام گەر هەمان مرۆڤ شكستی هێنا، ئەوا هەموو ئەو كەسانە لێی دووردەكەونەوەو سەرزەنشتی دەكەن.




زۆرێك لە خەڵكی ڕۆژانە نێوماڵو نووسینگەكانیان پاك دەكەنەوە، بەڵام كەمێك لەوان عەقڵو بیرۆكە خراپەكانیان پاك دەكەنەوە!






باشترین ڕێگە بۆ فێربوون، بریتییە لە فێرکردن.




هیچ مرۆڤێك كامڵ و تەواو نییە، لە پێش هەموو كەسەوە منو تۆ!




مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بە بێ خەڵكی ژیان بگوزەرێنێت، هەرچەندە كەسێكی سەركەوتووش بێت.




سەركەوتن «١٠٠٠» هاودڵ و هاوبەشی هەیە، هەر كات مرۆڤ لە كاردكانیدا سەركەوتنی بەدەستهێنا، زۆرێك لە خەڵكی بۆ لای دەگەڕێنەوەو لە دەوری كۆدەبنەوە، بەڵام گەر هەمان مرۆڤ شكستی هێنا، ئەوا هەموو ئەو كەسانە لێی دووردەكەونەوەو سەرزەنشتی دەكەن.




زۆرێك لە خەڵكی ڕۆژانە نێوماڵو نووسینگەكانیان پاك دەكەنەوە، بەڵام كەمێك لەوان عەقڵو بیرۆكە خراپەكانیان پاك دەكەنەوە!






تێپەڕبوون بە سەردەمی نارەحەتیو کۆسپو تەگەرەکانی ژیاندا، وەکو «پیشەیی، ماددی، کۆمەڵایەتی، خێزانی، تەندروستی»، کارێکی ئاسایی‌و سروشتییە، چونکە ژیان لە چوار وەرز پێکهاتووە، ناتوانین وەرزی پاییز، یان زستان، یاخود هاوینی گەرمو وشك، ڕەت بکەینەوە، کەواتە پێویستە لە هەر چوار وەرزەکەدا، دان بە خۆماندا بگرین!




تاقیکردنەوەی جۆری زێڕ، بە ئاگر دەبێت!




پێویستە مرۆڤ، زەمانی بە کارنەهێنێت بۆ شکاندنی پشتی!




ئەو کەسەی زۆر پێدەکەنێت، ئەو کەسەیە کە لە کۆتاییدا پێدەکەنێت!!




پێویست نییە مرۆڤ هەموو شتەکانی دەوروبەری بە چاوی خۆی ببینێت، پاشان بڕوا بەبوونی بهێنێت، مەگەر هەر یەکێك لە ئێمە بڕوای بەوە نییە.. کە هەوا بوونی هەیەو ناشتوانێت بیبینێت؟

ئایا هیچ کام لە ئێمە پێش داهێنانی کارەبا، ڕووناکی گڵۆپەکانی بینیوە؟ کەواتە مەرج نییە ئەوەی ئێمە نەیبینین، بوونی نەبێت!!




مرۆڤ دەتوانێت خۆی بگۆڕێت، هەروەها دەتوانێت هەر نەریتو هەڵسوکەوتێک کە پێیخۆشە هەڵیبژێرێت، کەواتە ئەوە ڕاست نییە کە دەڵێت: ئەو خووەی فێری بوویت، ناتوانیت وازی لێبێنیت، ئەم قسەیە بەرهەمی چەندین خاوەن ئەزموونو کەسانی شارەزایە.




کەسانێک هەن دەیانەوێت بەرهەمەکانیان بچننەوە، پێش ئەوەی پێبگات، نازانن بەرهەمی پێنەگەیشتوو، لەبری سوود، زیانی هەیە، لەبەرئەوە فێربە.. چۆن ئارام دەگریت؟! پێش چنینەوەو گەیشتن بە هیواو خەونەکانت!




تەنانەت ئەو کەسەی ناپاکی لە نیشتمانەکەی دەکات، هۆکارو بیانوو بۆ ناپاکییەکەی دەهێنێتەوە، بەڵام ئەو بیانوو هۆکارانە تۆمەتی ناپاکییەکەی ناسڕنەوە، لەبەرئەوەی بیانووگەلێک هەن، لە تاوان قێزەونترن!




ئەو کەسەی دەستی لە نێو ئاگردایەو قسە دەکات، هەڵسوکەوتی جیاوازە لەو کەسەی دەستی لە نێو ئاودایە، بەمەش بە تەواوی دەزانین هەستی ئەو کەسەی بە گۆچان دەڕوات، جیاوازە لەو کەسەی گۆچانەکە دروست دەکات.




هیچ کات لە کێبەرکێ نەترسم، چونکە کێبەرکێ مرۆڤ ناچار دەکات هەموو تواناکانی بخاتە گەڕ، بەمەش ماسوولکەکانی گەشە دەکات.

## ژیان فێری کردم

هەموو ئەو شتانەی لەم ژینەدا قەبارەیان گەورەیە، دەتوانین بیانکەینە پارچەی بچووک بچووک!




قسە ئەگەر لە دڵەوە بوو، بەر دڵ دەکەوێت، ئەگەر لە زمانیشەوە بوو، بەرگوێچکە.



# ژیان فێری کردم

مرۆڤ هەرچەندە دڵسۆزو بە وەفا بێتو حەز بە کاری چاکە بکات، کاتێک بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات، ناتوانێت ئاوابوونی خۆر ببینێت، هەرچەندە نیازیشی پاک بێت، لەبەرئەوە پێویستە مرۆڤ پلان دابنێت، بۆئەوەی سەربکەوێت!






له ژیاندا کۆمەڵێک بڕیاری گرنگ هەیە، پێویستە مرۆڤ بوێرانە ئەو بڕیارانە بدات، هەر چەندە سەختیش بن و خەڵکانێکیش لە دەوروبەرت توڕەو نیگەران بکات.




خاوەنی عەقڵە بچووکەکان، تەنها بیر لە کاروبارە بچووک و سادەکان دەکەنەوە.




دیارییەکی بچووک و سادەی چاوەڕوان نەکراو، کاریگەری زۆر گەورەترو زیاترە، لە دیارییەکی بە نرخی چاوەڕوانکراو.




مشتومڕ لەگەڵ کەسانی نەزاندا نەکەم، چونکە خەڵکی لێیان تێکدەچێت، کامەمان نەزانین.



# ژیان فێری کردم

مرۆڤ هەروەکو چۆن جلوبەرگو هاوڕێو کتێبو شوێنی نیشتەجێبوونی هەڵدەبژێرێت، بە هەمان شێوە پێویستە بیروبۆچوونی ڕاستو گونجاو هەڵبژێرێت.





ئەگەر پارێزگاریت لە ئارامیو شکۆمەندی خۆت کرد، با مشتومڕو گفتوگۆی نێوانتان زۆر توندوتیژیش بێت، ئەوا تۆ دەبیتە خاوەنی هەڵوێستو دەتوانیت دڵی بەرامبەر بۆ نێو ڕیزەکانی خۆت ڕابکێشیت، لە هەمان کاتدا دەتوانیت ڕای گشتیش بە دەستبهێنیت، لە کۆتاییشدا کێشەکە لە بەرژەوەندی تۆ تەواو دەبێت.



ئەم دنیایە بە وێنەی ئاوێنەیە، تەنها ئەو وێنانەمان پیشان دەدات کە پێی دەدەین، کاتێك تۆ سکاڵا لە دەست دنیا دەکەیت، ڕووخسارێکی خەماویت پیشاندەدات، ئایا تۆ ڕووخسارێکی جوانو گەشت پیشانداوە؟!

ژیان فێری کردم

ئەوەی کار نەکات، هەڵەش ناکات.



لوتکەی هەموو ژیانێکی سەرکەوتوو، ئارامگرتنو لەسەرخۆییە!








چارەنووست بە سروشتی خۆتەوە بەندە، سروشتیشت دەرەنجامی هەڵسوکەوتو هەڵچوونەکانتو کاردانەوەکانتە. هەڵسوکەوتو کاردانەوەکانیشت دووبارەکردنەوەی ئەو کردارانەیە، کە بیروبۆچوونەکانت پێت ڕادەگەیەنن، بیروبۆچوونەکانیشت دەرەنجامی ئەو ئاماژانەیە کە لەلایەن خەڵکیو بارودۆخو ئەو ژینگەیەی دەوروبەرت پێت دەگات.




ببە بە خاوەنی بارودۆخ، نەک کۆیلەی بارودۆخ، بۆئەوەی ببیتە خاوەنی بارودۆخ، سەرەتا پێویستە سەرکردایەتی دەروونی خۆت بگریتە ئەستۆ، چونکە مرۆڤ دەتوانێت هەموو ئاواتەکانی بهێنێتە دی، بە ئارامگرتنێکی ڕێکوپێکو بەردەوام.




فەرهەنگی سەرکەوتن، لە هەر دوو وشەی «ئەگەر» و «بەڵام» پێک نەهاتووە.






لە هەموو مرۆڤێکدا لایەنی باشو لایەنی خراپ هەیە، پێویستە لەسەرمان لایەنە باشەکان بەهێز بکەین.




هەوڵبدە هەموو ڕۆژێك بە سەر دوێنێتدا سەربکەویت، ڕەزامەندی ویژدانت بە دەستبهێنە، پێویستە خۆشحاڵیو ئاسوودەییت لەلا گەورەتر بێت، لە پێداهەڵگوتنی هەموو جیهان.




نەرمونیانی لە ڕادەبەدەر لەگەڵ خەڵکیدا، ئازارەکانیان زیاد دەکات.

## ژیان فێری کردم

بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك، هەمیشە ڕێگای چاکترو باشتر هەیە، بۆیە پێویستە بۆ ئەنجامدانی کارەکانمان، هەمیشە هەوڵ بدەین ڕێگای باشتر بدۆزینەوە.



دوو شت لەم ڕۆژگاردا زۆر گرنگن:

یەکەم: پێویستە لەسەر دەوڵەمەندان بیربکەنەوەو بزانن هەژارو دەردەدارەکان، چۆن ژیان دەگوزەرێننو چەندە بە دەست گرفتو ناڕەحەتییەکانەوە دەناڵێنن!

دووەم: پێویستە هەژارەکانیش فێربن، کە چۆن دەوڵەمەندەکان کار دەکەنو بیردەکەنەوە، لەوانەوە پەند وەربگرنو فێری ڕێگاکانی گەیشتن بە دەوڵەمەندی ببن.





پێویستە مرۆڤ خەون بە ئەستێرەکانەوە ببینێت، بەڵام دەبێت لە یادی نەکات کە پێیەکانی لە سەر زەوین.

## ژیان فێری کردم

کاتێك پێدەکەنیت، جیهان بۆت پێدەکەنێت، کاتێکیش دەگریت، بە تەنها خۆت دەگریت.

## ژیان فێری کردم

پێویست ناکات مرۆڤ هەوڵبدات بۆئەوەی ببێتە کەسێکی سەرکەوتوو، بەڵکو پێویستە سەرەتا هەوڵبدات ببێتە مرۆڤێکی ئاکار جوانو بە نرخو ڕەوشت بەرز، ئەو کات سەرکەوتن خۆی بەرەو ڕووی دێت!

## ژیان فێری کردم

باشترین چەك کە مرۆڤی سەرکەوتوو خاوەنییەتی، بریتییە لە کاتو ئارامگرتن.





جیاوازی مرۆڤی سـەرکەوتوو، سەرنەکەوتوو، بریتی نییە لە هێزو توانا و شارەزایی، بەڵکو بریتییە لە ویستو ئیرادەی بەهێز.



هەموو ئەو دۆزینەوەو داهێنانانەی ئەمڕۆ دەیانبینین، پێش داهێنانو دۆزینەوەیـان خەڵکانێك دەیانگـوت، کاری لەو جـۆرە، یەکجار ئەستەمەو هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت بە دەستی بهێنێت.



زەردەخەنەیەك هیچی تێناچێت، بەڵام واتاو مانای زۆر دەبەخشێت.



سەرکردەی سـەرکەوتوو، هەموو کات بەرپرسـیارێتی شکست دەخاتە ئەسـتۆی خۆی، لەبەرئەوە دەڵێت: من شکستم هێنا، هەرگیز ناڵێت سەربازەکانم شکستیان هێنا!






زۆربەی ساتەکانی بەختەوەری لە ژیاندا، ئەو ساتانەن کە دەتوانیت ئەو شتانە بە دەستبهێنیت، کە خەڵکی دەڵێن: هەرگیز ناتوانیت ئەو شتانە بەدەستبهێنیت.



ئەو کەسە ئازاو بوێرانەی لە ڕووبەڕووبوونەوەی شکست ناترسن، ئەو کەسانەن کە زاڵ دەبن، بەسەر هەموو کارە دژوارو سەختەکاندا، پاشان سەرکەوتن بە دەست دەهێنن.



شکستخواردن، خراپترین شت نییە لەم جیهانەدا، بەڵکو خراپترین شکستخواردن، ئەوەیە کە تاقی ناکەینەوە.



مرۆڤ «٣» کاتژمێر زووتر بگاتە سەر کارەکەی، چاکترە لەوەی تەنها یەك خولەك دوابکەوێت.



پێویستە مرۆڤ بەردەوام لە خۆی بپرسێت کە هیواو ئاواتو ئارەزووی لە چییە لەم ژیانەدا بە دەستی بهێنێت؟ ئەگەر زانیت، ئەوا هیچ بوارێك بۆ شکست نامێنێتەوە.






گرنگ نییە کە شکست دەهێنیتو دەکەویت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئایا دەتوانیت لە دوای کەوتنو شکست، هەڵسیتەوە؟




شکستخواردن هەڵێکی نوێیە، بۆ دەستپێکردنەوەی جاری دووەم بە زیرەکیو لێهاتووییەکی باشتر.

ژیان فێری کردم

لە هەر بارودۆخێکدایت، بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی لە ژیان بکە، فێری زەردەخەنەو پێکەنین بە، خەمەکانی جیهان مەدە بە کۆڵی خۆتدا!

ژیان فێری کردم

کردەوەی چاک، زۆر چاکترە لە قسەی چاک.





# ژیان فێری کردم

کێبەرکێ لەگەڵ خودی خۆتدا، گەورەترو چاکترو سەرکەوتوو ترە، لە کێبەرکێ لەگـــەڵ جیهاندا، هەرکاتێک مرۆڤ کێبەرکێ لەگەڵ خۆیدا بکات، ئەو کاتە پێش دەکەوێت، بە شـــێوەیەک کە ئەمڕۆی وەکو دوێنێ نابێت، هەروەها سبەینێشی وەکو ئەمڕۆ نابێت.





بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باش‌و نایاب کاربکەیت، پێویستە:

- لە کاتێکدا لە یەك کار زیاتر نەکەیت.
- کێشەو گرفتەکان دیاری بکە.
- فێربە چۆن بە گرنگی‌و پەرۆشەوە گوێ دەگریت.
- فێربە چۆن پرسیار دەکەیت.
- فێربە چــۆن جیاوازی دەکەیت، لە نێــوان کارێکی گرنگو کارێکی ناگرنگدا.
- قبوڵی گۆڕانکاری بکە.
- دان بە هەڵەکانتدا بنێ.
- فێربە چۆن بە شێوەیەکی ئاسان، باس لە بیروبۆچونت دەکەیت.
- فێربە چۆن پارێزگاری لە ئارامیت دەکەیت.
- بە پێی تێڕوانینت بۆ بارودۆخ، زەردەخەنە بکە.



هەموو ئەو داهێنانە گەورانەی لەم ژیانەدا دەیانبینین، بە بیرۆکەیەك دەستی پێکردووە، سەرەتا زۆر سادە بووە.



ئەگەر توانای ئەنجامدانی کاری باشترت هەبوو، کاری باش بەس نییە.

ژیان فێری کردم

شکستخواردووەکان، هەمیشە دەڵێن: هۆکاری سەرکەوتن. تەنها شەنسو بەختە.

ژیان فێری کردم

زۆربەی ئەو کارانەی ناپاکی دەگەیەنن لە لامان، لە گومانەکانمانەوە سەرچاوەیان گرتووە.

ژیان فێری کردم

دوو ڕێگە هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ناڕەحەتییەکانی ژیان، یەکەمیان: دەبێت ناڕەحەتییەکان بگۆڕیت، ئەمەش کارێکی ئەستەمو ناکرێت، بەڵام لە دووەمیاندا دەکرێت کاردانەوەمان بگۆڕین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ناڕەحەتییەکان.






هەموو کاروبارو فەرمانەکان لە ژیاندا ڕێژەییە، دەگونجێت کارێک لای کەسێک گەورەو بە نرخ بێت، بەڵام کەسێکی دیکە هەمان کار بە کارێکی سادەو ساکار سەیر بکات، هەموو شتێک پەیوەستە بە ئامانجەوە، بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤێک بەرنامەو پلانی دانا تەنها بۆ ئەوەی بژێوییەکی باش بۆ منداڵەکانی بەدەستبهێنێت، سەرەنجام توانی لەو کارەیدا سەرکەوتوو بێت، ئەوە کەسێکی سەرکەوتووە، بەڵام ئەگەر مرۆڤێکی دیکە پلانو بەرنامەی دانا بۆ کردنەوەی «٤٠» کۆمپانیا، سەرەنجام توانی «٣٠» کۆمپانیا بکاتەوە، ئەوە کەسێکی شکستخواردووە، بە بەراورد بە بەرنامەو ئامانجو پلانەکەی.



گرنگ نییە ئێستا تۆ لە کوێیت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە، لەم ساتەدا تۆ ئاڕاستەت بەرەو کوێیە!



مرۆڤ وەکو کیسەڵ بە ڕێگایەکی ڕاستدا بڕوات، چاکترە لەوەی وەکو ئاسک بە ڕێگایەکی هەڵەدا بڕوات.



سەرکەوتن خۆی لە پشت دانانی ئامانجو پلانو بەرنامەڕێژییەوە حەشارداوە، بەڵام بەختەوەری لە خۆشەویستیو چێژوەرگرتنو بەدیهاتنی هیواو ئاواتەکانەوە، خۆی حەشارداوە.



پێویستە لەسەرمان بڕیار نەدەین بەسەر ئەو کەسانەدا کە هەوڵدەدەنو شکست دەهێنن، بەڵکو دەبێت بڕیار بە سەر ئەو کەسانەدا بدەین کە شکست دەهێنن لە هەوڵدان.



# ژیان فێری کردم ٧

ئەگەر بتەوێت هەموو ئەو کەسانە ڕازی بکەیت کە دەیانناسیت، یان دەتناسن، ئەوا لە هەر ڕۆژێکدا پێویستت بە «١٠٠» کاتژمێر کات هەیە، لەگەڵ ئەوەشـــدا دووچاری ڕەخنەی تووونـــد دەبیتەوە، چونکە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی هەموو خەڵکی، کارێکی ئەستەمە.



## ژیان فێری کردم

خەڵکی ئەو خێراییەیان بیردەچێتەوە کە لە ئەنجامدانی کارەکەتدا بە دەستت هێناوە، بەڵام بیر لە جۆری دەستکەوتەکەت دەکەنەوە.

## ژیان فێری کردم

پێویستە لەسەرمان کە زۆر سەرنجمان لەسەر ئاراستەی (با) قاڵ نەکەینەوە، بەڵکو پێویستە سەرنجمان لەسەر چۆنییەتی جووڵانەوەی چارۆکەکە قاڵ بکەینەوە.

## ژیان فێری کردم

ئەو کەسەی دەیەوێت سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، پێویستە لە هیچ شتێک نەترسێت، جگە لە ترس!

## ژیان فێری کردم

ئێمە وەکو خۆی لە جیهان ناڕوانین، بەڵکو وەکو خۆمان لە جیهان دەڕوانین!

## ژیان فێری کردم

بەهێزترین شت لەم ژیانەدا ئەو بیروبۆچوونەیە، کە ئێستا کاتی دروێنەی هاتووە.

## ژیان فێری کردم

مرۆڤ کار بکاتو پەشیمان بێتەوە، چاکترە لەوەی ئاواتەخواز بووایە کە ئەو کارەی بکردایە. «کورد وتەنی: کردە پەشیمان بە، نەک نەکردە پەشیمان».

## ژیان فێری کردم

زۆربەی بارودۆخی مایەپووچی ترسناک، ئەوەیە کە مرۆڤ هیواو ئاواتو وردبەرزی لە دەست دەدات.

## ژیان فێری کردم

جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان شارەزایی ساڵەکانو ساڵەکانی شارەزاییدا، کەسانێک هەن خاوەنی «١٠» ساڵ شارەزایین، بەڵام ساڵێک شارەزایی «١٠» جار دووبارە دەکەنەوە.






لە ٩٥٪ خەڵکی هەڵەکانیان نابینن، وەکو چۆن حوشتر کۆپاردەکەی خۆی نابینێت، هەرچەندە گەورەو دیاریشە.

## ژیان فێری کردم

گفتوگۆو وتوێژ، بە تایبەت لەگەڵ کەسانی نەزاندا، بە هەموو واتایەك هەڵەیە، چونکە خەڵکی بە ئاسانی دان بە هەڵەکانیاندا نانێن.

## ژیان فێری کردم

ڕاشکاویی لەم ژیانەدا، دوژمنو ناحەزانێکی زۆرت بۆ زیاد دەکات، لەبەرئەوە ڕاشکاویی، هەمیشە پشوودانو حەوانەوە نییە.

## ژیان فێری کردم

ئێمە لە جیهانێکی ناتەواودا دەژین، لەگەڵ خەڵکانێکدا کە بێ کەموکورتی نین، کەواتە ئاگاداربە، پەیژە بە پانی هەڵنەگریت!

## ژیان فێری کردم

پێویستە مرۆڤ هەرگیز نەڵێت: لە کارەکەمدا چەند دووچاری دەردەسەریو ناڕەحەتیو ماندووبوون بووم، بەڵکو پێویستە بڵێت: لە کۆتاییدا چیم بەدەستهێناوە؟

## ژیان فێری کردم

لە «لی، ئایا، کوکا»وە فێربووم، کاتێك وتی: ئەگەر داوام لێبکرێت، سیفاتی بەڕێوەبەری سەرکەوتوو لە تەنها وشەیەکدا کۆبکەمەوە، ئەوا دەڵێم: «بڕیاردان»، چونکە ئەگەر چاکترین کۆمپیوتەرت هەبێت، باشترین ژمارەت پێ ببەخشێت، لە کۆتاییدا پێویستت بە «بڕیاردان» هەیە.

## ژیان فێری کردم

دوو ڕێسا هەیە بۆ خزمەتکردنی کڕیارەکانت:

ڕێسای یەکەم: هەمیشە کڕیار لەسەر حەقە.

ڕێسای دووەم: ئەگەر کڕیار هەڵەبوو، ڕێسای یەکەم بخوێنەرەوە.




پێویستە مرۆڤ، پەند لە هەڵەکانی وەربگرێت.




سەرکەوتن بریتییە لە گەشتێك، نەك تەنها ئامانج، پێویستە سەرەتا چێژ لەو گەشتە وەربگرین، لە ڕێگای گەیشتنت بەو شوێنەی کە ئاواتەخوازی پێی بگەیت.




بەخت بریتییە لە خاڵی بە یەکگەیشتنی نێوان ئامادەکاری باش و ئەو هەلەی کە گوزەر دەکات بەسەرتدا.




پێشبڕکێکاری لێهاتوو، بەردەوام سەرنجی لەسەر ئامانجەکەیەتی و بەرەو ئامانجەکەی دەڕوانێت، هەرگیز بۆ خوارەوە ناڕوانێت، بۆئەوەی ترس و بیم لە بیروهۆشیدا بڵاونەبێتەوە.




ئەگەر خاوەنی هیواو وردەبەرزییەکی نایاب بوویت، بۆ هەر گرفتێک، چارەسەرێک دەبینیت.




خەڵکانێک بە ئاراستەی کەشتی مەلە دەکەن، خەڵکانێکی دیکەش لە چاوەڕوانی هاتنی کەشتییەکەدا، کاتەکانی خۆیان بە فیرۆ دەدەن.





بۆ ئەوەی ڕووناکی چراکەت بەردەوام بێت، پێویستە بەردەوام ئەوتی تێ بکەیت.

## ژیان فێری کردم

هەمیشە دەستپێکردن، قورسترین بەشی کارە.

## ژیان فێری کردم

مرۆڤ کاتێك شکست دەهێنێت، کۆتایی نایەت، بەڵکو ئەو کاتەی پاشەکشە دەکات کۆتایی دێت.

## ژیان فێری کردم

هیچ شتێك لەم ژیانەدا بە دەستنایەت، بەبێ وردبەرزیو پەرۆشیو گەرموگوڕی.

## ژیان فێری کردم

ژیان بریتییە لە سەرکەوتنو شکستخواردن، هەروەها لە بەدیهاتنی ئاواتەکانو لە دەستدانی هیواکان.




سەرنجدان لە شتە ساکارو ئاسانەکان، لای زۆرێك لە خەڵکی بە ئاسانی پشتگوێ دەخرێت، بەڵام هەندێك کەس بەو شتە سادەو ساکارانە دەوڵەمەند دەبن.




کارگێڕی پراکتیزەییو سەرکەوتوو، واتە دەرکردنی بڕیار بە خێرایی، کاتێك کەسانێکی شیاوو لێهاتوو دەبینێت، بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە.




بۆ ئەوەی هانی کەسانی تر بدەین، پێویستە سەرەتا هانی خۆمان بدەین.




کلیلی شکستخواردن، بریتییە لە ڕازیکردنی هەموو ئەو کەسانەی دەیانناسیت.






دوێنێ، ئەو چەکە بانکییەیە کە ڕاتکێشاوە، سبەینێش ئەو چەکە بانکییەیە کە دواخراوە، بەڵام ئێستا تاکە چەکی بانکییە کە لەبەردەستتدایە، لەبەرئەوە پێویستە بە دانایی‌و کارزانی خەرجی بکەیت.



هەر کەسێك نەتوانێت کۆنترۆڵی کاردانەوەی خۆی بکات، دەکەوێتە ژێر ڕکێفی کەسانی دیکەو بارودۆخەوە!



لە ناپلیۆنیان پرسی: چۆن توانیت متمانەبەخۆبوون لە دەروونی سوپاکەتدا دروست بکەیت؟

لە وەڵامدا گوتی: بەردەوام بە سێ وشە وەڵامم دەدانەوە:

ئەوەی دەیگوت: ناتوانم، پێم دەگوت هەوڵبدە!

ئەوەی دەیگوت: نازانم، پێم دەگوت فێربە!

ئەوەی دەیگوت: مەحاڵە، پێم دەگوت تاقی بکەرەوە!



سەرکەوتن پێویستی بە بوێریو جەربەزەیی هەیە، چونکە کەسانی شەرمن، لەم ژیانەدا زۆر پێش ناکەون!



ئەو کەسەی بەدوای هاوڕێی بێ کەموکورتیدا بگەڕێت، سەرەنجام بێ هاوڕێ دەمێنێتەوە.






سەرەڕای ئەوەی مرۆڤ تەنها یەکجار دەژی، ئەو کەسەی گەرموگوڕ «حماســە»تی نییە، ژیانی لەلا خۆش نییە، بەم بیرۆکەیەش ژیان لە خۆیان تێکدەدەن. هەر ئەمەش جیاوازی نێوان گەشــبینو ڕەشبینە، ڕەشبین گەرموگوڕ نییە، ئەوەش واتە بەختەوەر نییە. بەڵام گەشبین گەرموگوڕی لە هەموو لایەنەکانی ژیانییەوە هەڵدێت، بەمەش دەبێتە مرۆڤێکی بەختەوەر، لە هەموو بارودۆخێکی ژیانیدا!




هەرگیز ژیری لەگەڵ حەسودیو ئیرەییدا کۆنابنەوە، ئەو کاتەی حەســوودی، یان ئیرەیی هەبوون، توانای ڕازیکردنی کەسی حەسوود، کەم دەبێتەوە!




هەموو ئەو شــتانەی ڕووبەڕوومان دەبنەوە، جیاوازی دروست ناکەن، بەڵکو ئەوەی جیاوازی دروست دەکات، چۆنییەتی هەڵسوکەوتمانە لە بەرامبەر ئەو شتانەی ڕووبەڕوومان دەبنەوە.

# ژیان فێری کردم

وەکو ئەستێرە وابم، کە هەمیشە بێدارە، بۆ ئەوەی ئاسۆی کەسانی تر ڕووناک بکاتەوەو ژیانو گوزەرانیان ڕازاوە بکات، بەبێئەوەی چاوەڕێ بکات، کە کێ بۆی دەڕوانێت، یاخود کەسێک پێی بڵێت: سوپاس!






لە بری گوفتاری زۆر، کردەوەی زۆر ئەنجام بدەم، چونکە ئەو کەسەی گوفتاری زۆرە، کرداری کەمە.

## ژیان فێری کردم

دڵم نەبەخشم بەو کەسەی خۆشم دەوێت، بەڵکو بیبەخشم بەو کەسەی خۆشی دەوێم!

## ژیان فێری کردم

ئامانجێکی ڕوونم بۆ ژیان هەبێت، چونکە ژیان چەند ساتێکە، بێگومان هەر پێی دەگەیت.

## ژیان فێری کردم

هەرگیز لە بڕیاردان‌دا پەلە نەکەم، چونکە زۆرجار ڕواڵەت هەڵخەڵەتێنەرە.






سەرەتا بە دوای خۆمدا بگەڕێمەو لە خۆم تێبگەم، پاشان بە دوای كەسانی دیكەدا بگەڕێمەو لێیان تێبگەم.




مرۆڤ چەندە جوانە، كاتێك ئازاری دەگاتو قسە ناكات، دەگریو هاوار ناكات، مەرج نییە هەموو ئەو مرۆڤانەی لێو بە خەندەن، بەختەوەرو شادمان بن، چونكە لە پشت هەموو خەندەیەكەوە، ئازارێكی بەهێزو جەرگبڕ هەیە!




چوار شت هەرگیز ناگەڕێنەوە:

ئەو بەردەی فڕێی ئەدەیت، ناگەڕێتەوە، ئەو قسەیەی دەیكەیت، ناگەڕێتەوە، ئەو هەلەی لە دەستت دەچێت، ناگەڕێتەوە، هەرگیز لاوێتیو ئەو كاتەی بەسەرت بردووە، ناگەڕێنەوە!





هاوڕێییەتی وەکو پەرتووک وایە، بۆ نووسینەوەی پێویستی بە چەند ساڵێک هەیە! بەڵام بۆ سووتاندنی تەنها پێویستی بە چەند چرکەیەک هەیە!

## ژیان فێری کردم

هاوڕێ کۆنەکانت وەکو ئاڵتوون وان، هاوڕێ تازەکانیشت وەکو ئەڵماس، ئەگەر ئەڵماست بەدەستهێنا، ئاڵتوونت لە یاد نەچێت، چونکە تەنانەت هەڵگرتنی پارچەیەک ئەڵماسیش، پێویستی بە بناغەیەکی ئاڵتوونی هەیە.

## ژیان فێری کردم

گوڵێک بە دیاری بدەیتە مرۆڤێک، کاتێک لە ژیاندایە، باشترە لە چەپکە گوڵێک کە لەسەر گۆڕەکەی دایبنێیت.

## ژیان فێری کردم

هەرگیز ڕێگە مەدە چرکەیەک لەم ژیانەدا بێ ئامانج بژیت، چونکە هەموو ساتێکی بێ ئامانج، مردنێکی بێدەنگە!








ئەگەر بۆ یەکەمجار بە کەسێک گەیشتم، بە پێی ڕواڵەتی هەڵسەنگاندنی بۆ ئەکەم، پێویستە مۆڵەتی پێ بدەم، تا بێتە گۆو قسە بکات، ئەو کات بە پێی عەقڵی هەڵیسەنگێنم.






هەمـــوو ئەو هەنگاوانـــە بژمێرم کە بۆ پێشـــەوە ناومە، چونکە ئەگەر تەنها یەك هەنگاوم لێتێکبچێت، ئەوا بۆ دواوە دەگەڕێمەوە.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر لە شـــێنەیی‌و کاتی ئاساییدا خواپەرست بم، خوای گەورە لە ناڕەحەتی‌و تەنگانەدا بە هانامەوە دێت!

## ژیان فێری کردم

گرنگترین شت لەم ژیانەدا، بریتییە لە باوەڕبوون بە خوای گەورەو هەوڵدان بۆ ئەوەی لە ڕێگەی پەرستن‌و گوێڕایەڵی فەرمانەکانییەوە، لێی نزیك ببیتەوە.

## ژیان فێری کردم

هیـــچ کات بۆ ڕابـــردوو نەڕوانم، چونکـــە ڕۆژگارەکانی ڕابردوو کۆتاییـــان هاتووەو هەرگیز ناگەڕێنەوە، بەڵکـــو بۆ ئاینده بڕوانم، کە پڕە لە هیواو ئاواتی گەشبینی.



لە ئیرەیی و گومان بردن، دووریکەومەوە، چونکە بنەمای لە ناوبردنی ژیانن!

## ژیان فێری کردم

لەبەردەم دۆستو دوژمندا لێوبەخەندە بم، یەکەمیان دڵخۆش و خۆشحاڵ دەبێت، دووەمیشیان فێر دەکات تا بیریکاتەوە!

## ژیان فێری کردم

جوانی ڕاستەقینە، بریتییە لە جوانی ئاکارو ڕەوشتبەرزی، نەك جوانی ڕووخسار!

## ژیان فێری کردم

بەختەوەری ڕاستەقینە بریتییە لە: خۆبەکەمزانین و شانازیکردن بە کەسوکارو خوشکو براو دۆستانتەوە.

## ژیان فێری کردم

لە کۆتاییدا، هەر ڕاستی سەردەکەوێت!






سەرکەوتن ئاسان نییە، ئەگەر پێی گەیشتی، پارێزگاری لێ بکە، بۆئەوەی بۆنی گوڵ بکەیت، نابێت لە دڕك بترسیت!

## ژیان فێری کردم

متمانەم بە خۆمو تواناکانم هەبێت، تا کەسانی دیکەش متمانەم پێ بکەن.

## ژیان فێری کردم

دڵم بکەم بە شارێك، ماڵەکانی خۆشەویستی بێتو ڕێگاو شەقامەکانیشی لێبووردن!

## ژیان فێری کردم

هەرگیز لە بەخشیندا، چاوەڕوانی پاداشتو سوپاس نەبم!

## ژیان فێری کردم

بۆ ئەوەی بتوانم لەگەڵ خەڵکیدا ڕاستگۆ بم، پێویستە سەرەتا لەگەڵ خۆمدا ڕاستگۆ بم!



# ژیان فێری کردم ٧

خێزانو کەسوکار، وەکو ئەو درەختە وان کە لقوپۆپی زۆرە، هیچ کام لە لقەکان مەبڕە، بەردەوام پارێزگاری لەو درەختە بکە، ئاوی بدەو گرنگی پێ بدە، بۆئەوەی گەورە بێتو گەشە بکاتو بەردەوام سەوزو جوان بێت، ئەمەش بە سەردانو هەواڵ پرسینو بە دەمەوە چوونیان دەبێت، کەواتە بەردەوام پەیوەندییان پێوە بکەو هیچ کات دەنگیان لێ دامەبڕە!






هیــواو ئاواتەکانم بکەم بە گڵۆپێک، کە بۆ هەموو شــوێنێک هاوڕێم بن!

## ژیان فێری کردم

ئەگەر دڕکێک چوو بە پێیەکانمدا، دڵگران نەبم، چونکە دڕک لە هەر شوێنێک بێت، مانای ئەوەیە لە چواردەوریدا گوڵ هەیە!

## ژیان فێری کردم

دنیا وەکو ئاوی شــۆر وایە، هەرچەند لێی بخۆیتەوە، تینوێتیت زیاد دەکات!

## ژیان فێری کردم

ستەم هەرچەندە تەمەنی زۆر بێت، بەڵام هەر کۆتایی دێت!

## ژیان فێری کردم

گــوێ بۆ بیروڕای هەموو کەس بگرەو ڕێــز لە بۆچوونەکانیان بگرم، بەڵام مەرج نییە باوەڕم پێیان هەبێت!

## ژیان فێری کردم

هەر کەس ڕێزی خــۆی نەگرێت، نابێت چاوەڕێ بکات، خەڵکی ڕێزی بگرن!

## ژیان فێری کردم

بــا بە ئامازش بێت، هەرگیز خۆم لە شــتێك هەڵنەقورتێنم، کە پەیوەندی بە منەوە نەبێت!

## ژیان فێری کردم

من لە ناو گەورەیی ژیاندا بە وێنەی ژمارە «سفر»م، ئەوەی پێویستە لەسەرم ئەوەیە، کە ئایا لای ڕاستی ژمارەکان بم، کە پڕبایەخ دەبمەو حســابم بۆ دەکرێو دەخوێنرێمەوە، یاخود لای چەپی ژمارەکان بم، کە بێبایەخ دەبمەو ناخوێنرێمەوە!

## ژیان فێری کردم

ئەگەر تۆ سێوێکت پێبوو، منیش سێوێك، سێوەکانمان گۆڕییەوە، ئەوا هەر یەکێکمان دەبینەوە بە خاوەنی ســێوێك، بەڵام ئەگەر تۆ بیرۆکەیەکت پێبوو، منیش بیرۆکەیەك، بیرۆکەکانمان گۆڕییەوە، ئەوا هەریەکەمان دەبین بە خاوەنی دوو بیرۆکە!



تەنانەت لەگەڵ دوژمنەکەشمدا، ڕاستگۆبم!

## ژیان فێری کردم

بە زۆری ئەو کەسانەمان خۆشدەوێت، کە لێمانەوە دوورن!



هەر کەسێك، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی کەسانی دی خۆی بگۆڕێت، لە کۆتاییدا خۆی دەدۆڕێنێت!

## ژیان فێری کردم

هەندێجار چاوەکانم ئەسرین هەڵوەرێنن، چونکە گریان پشووی دەروونە، ئارامی ڕۆحە، بە مەرجێك پێش ئەوەی دەوروبەر بمبینن، فرمێسکەکانم بسڕم!

## ژیان فێری کردم

هەرگیز لە ئەنجامدانی کاری چاکە، پەشیمان نەبمەوە!

# ژیان فێری کردم

لە پایزدا گوڵ بڕوێنم، لە زستاندا لە سەرما بیپارێزم، لە هاویندا بە سۆزو خۆشەویستی ئاوی بدەم، بەڵام نابێت خەمباربم ئەگەر لە بەهاردا کەسێکی دی گوڵەکانی لێکردەوە، چونکە ڕێبازی ژیان وایە، کەسانێک دەیچێننو کەسانێکی دیکە دەیدوورنەوە!






مرۆڤی ئازادو سەربەست، گەر ڕێزی خۆی نەگرت، دەبێتە کۆیلەو بەندەی کەسانی دی!

## ژیان فێری کردم

ڕووخساری زەردەخەناوی‌و ڕووی خۆش، کلیلی هەموو دڵێکە!

## ژیان فێری کردم

زیادەڕەویی کردن لە سـوعبەتو گاڵتـەو گەپدا، دەبێتە هۆی لە دەستدانی ڕێزی خاوەنەکەی!

## ژیان فێری کردم

مامەڵەی جوانو چاکو ڕەفتارو ئاکاری بەرز، دەرمانی لابردنی هەموو ڕقو کینەیەکە!

## ژیان فێری کردم

دڵو سینەم پاک بکەمەوە بەرامبەر بە کەسانی دەوروبەرم، بۆ ئەوەی بەرهەمەکەی لە دنیاو دوارۆژدا بدوورمەوە!

## ژیان فێری کردم

نهێنییەکانت، دیلو بەندەی خۆتن، ئاگاداربە لای هیچ کەس نەیاندرکێنیت، چونکە ئەوکات تۆ دەبیتە دیلو بەندەی نهێنییەکانت!

## ژیان فێری کردم

هەرگیز تف نەکەمە هیچ بیرێکەوە، چونکە ڕۆژێك دادێت ناچاربم ئاوی لێبخۆمەوە!

## ژیان فێری کردم

کاتەکانی خۆم بە فیڕۆ نەدەم، لەگەڵ کەسێکدا کە نایەوێت قسەم لەگەڵدا بکات، هەروەها قسەش نەکەم لەگەڵ کەسێکدا، کە گوێیەکانی داخستووە!

## ژیان فێری کردم

ژیان بە ویژدانەوە لەبەر ڕووناکی مۆمێکدا، زۆر باشترو ڕێزدارانەترە، لە ژیان بە بێ ویژدان، لەبەر چراخانی کۆشکو تەلارە بەرزەکاندا!




جوانی، بەبێ ئاکارو ڕەوشتی بەرزو جوان، وەکو گوڵی بێ بۆن وایە!



نە لە خۆشەویستیو نە لە ڕقو کینەدا، زیادەڕەویی نەکەم، ڕەنگە ڕۆژێك دابێت، ئەو هاوڕێیەی ئەمڕۆ زۆر خۆشتدەوێت، ببێتە ناحەزت، لەوانەشە ئەو کەسەی ئەمڕۆ زۆر ڕقت لێیە، ببێتە دۆستت!

## ژیان فێری کردم

مرۆڤ نازانێت ژیان چەندە کورتە، مەگەر ئەو کاتە نەبێت کە لە سەرەمەرگدایە!

## ژیان فێری کردم

ئەگەر بۆ جارێکیش بێت لە تەمەنمدا سەردانی زیندانو زیندانییەکان بکەم، بۆ ئەوەی قەدری نیعمەتی ئازادیو سەربەستی بزانم، هەروەها ساڵانە جارێك سەردانی دادگا بکەم، بۆئەوەی قەدری ئاکارو ڕەوشتی جوان بزانم، هەموو مانگێك سەردانی نەخۆشخانە بکەم، بۆ ئەوەی قەدری لەشساغیو تەندروستی بزانم، هەفتانە سەردانی باخچەیەك بکەم، بۆئەوەی قەدری جوانیو ڕازاوەیی سروشت بزانم، ڕۆژی جارێکیش سەردانی کتێبخانە بکەم، تا قەدری ژیریو دانایی بزانم!



سەرکەوتووەکان، ئەو کەسانەن کە دەتوانن هەڵەکان بقۆزنەوە!



ئاوی زۆرو بەخوڕ، هەرگیز بۆ دواوە ناگەڕێتەوە.



مرۆڤ بەبێ ئاکاری جوان، وەکو درەخت وایە بەبێ گەڵا، نەڕەنگی هەیەو نەبۆنی هەیەو نە سێبەری هەیەو نە تام!



مرۆڤ بەبێ هیواو ئاوات، وەکو جەستەیەکی بێگیان وایە، ئەو هیواو ئاواتەش، کە مرۆڤ کارناکات بـۆ بەدیهێنانی، وەکو ئەو خونچەیە وایە کە دەوەرێت، پێش ئەوەی مرۆڤ چێژی لێ ببینێت.





# ژیان فێری کردم

حەماسەتو گەرموگوڕی، باشترین توانا بۆ جێبەجێکردنی کاردکانت دابین دەکات، بەبێ حەماسەتو گەرموگوڕی، هیچ کارێکی گەورەو گرنگ، یان سەرکەوتوو، ئەنجام نادرێت، کەواتە پێویستە لە هەموو کاردکانتدا حەماسەتت هەبێت، هاوکات نابێت گڕی تاسەیەکی کورت کە لە پڕ دێتو دەڕوات، لەگەڵ حەماسەتێکدا تێکەڵ بکەیت، کە ڕووناکییەکەی بەردەوامە!




توانای کارکردن تەنها بە کارکردن بەدەستدێت، کەواتە تەنها بیر لەو کارە بکەرەوە کە لەبەردەستتدایە، بۆئەوەی بە هەموو توانایەکتەوە ئاراستەی خۆت بکەیتە ئەو کارە.

## ژیان فێری کردم

پێویستە چاك بم لەگەڵ ئەو کەسانەشدا، کە خراپن لەگەڵمدا!

## ژیان فێری کردم

تاڵیش، بە شیرین ببینم!

## ژیان فێری کردم

بەنرخترین شت کە ئێستا خاوەنین، بێگومان سبەینێ لە دەستمان دەچێت.

## ژیان فێری کردم

زۆر ئاسانە کەسێکمان خۆشبووێت، بەڵام زۆر گرانە بتوانین کەسێك بدۆزینەوە شایستەی خۆشەویستیمان بێت.



پێویستە تواناکانی خۆت بەهێز بکەیت، بەتایبەت ڕێزگرتن لە خودو بەهابەرزەکان، چالاکییەکانت ئاڕاستە بکە بۆ کاری بەسوودو نایاب، لەسەر ئەم بنەمایەش ڕێگەکەت ڕاست بکەرەوە.

## ژیان فێری کردم

لە کاتی هەوڵدانی بێ وچانتدا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت، دەبینیت بەربەستەکان ڕێگەت پێدەگرن، لەو کاتەدا بەردەوامیو بێوچانی مێرووڵەت بێتەوە یاد، کە چۆن بەربەستەکان ناتوانن ڕێگەی بەرەو ئامانجەکان پێ بگۆڕن.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر ئامانجت بریتی بوو لە پەرەپێدانی ماسولکەو هێزو بازووت، یان ژیریو عەقڵت، ئەوا ڕاهێنانو پیادەکردن بە شێوەیەکی بەردەوامو ڕێکوپێک لەسەر کرداری بەهێزکردنی ماسولکەو ژیریت، دەتوانن بتگەیەنن بەو ئامانجەی ئاواتی بۆ دەخوازیت!



وا دابنێ مێشکت بریتییە لە وێستگەیەکی بەرهەمهێنانی کارەبا لە شارێکی گەورەدا، ئایا ئەو وێستگەیە پێویستی بە ئەندازیارێکی زیرەک و لێهاتوو نییە؟

زیری ناوەکیت ئەو ئەندازیارەیە، دڵنیابە لەوەی مێشکت دەتوانێت بە باشترین شێوە چاودێری زیری ناوەکیت بکات، ئەگەر خۆت هەوڵی بۆ بدەیت!

## ژیان فێری کردم

پێویستە نەرمونیانیو توندوتۆڵی پێکەوە گرێ بدەیت، توندوتۆڵ بە، بۆ ئەوەی لە ئامانجەکانت پاشەکشە نەکەیت، نەرمونیان بە، تا بتوانیت لەگەڵ بارودۆخدا بگونجێیت، خۆت لە پێکادانی بەریەستەکان بپارێزە.



لە کاتی بەرپاکردنی جەنگدا، وا مەزانە کە بۆ زاڵبوون بەسەر ڕکابەرەکەتدا پێویستە لەو بەهێزتر بێت، سەیری ڕاهێنەری درندەکان بکە، دەبینیت ڕاهێنەرەکە لە ئاژەڵە درندەکە بەهێز تر نییە، بەڵام بەسەریدا زاڵە!






هەموو گورگێك دوژمن نییە، هەموو چۆلەكەیەك هاوڕێ نییە، هەموو كەروێشكێك ماڵی نییە، هەموو شێرێك دڕندە نییە.. هەموو منداڵێك پاك و بێگەرد نییە، هاوكات هەموو ڕێوییەك فێڵباز نییە.




هەموو دووپشکێک کوشندە نییە، هەموو سەگێکیش بەوەفا نییە، هەموو پشیلەیەکیش سپڵە نییە!

## ژیان فێری کردم

هەموو شتێک کۆتایی هەیە، هەروەکو چۆن هەموو شتێک سەرەتایەکی هەیە.

## ژیان فێری کردم

ئارام بگرم لەسەر برینو ئازاری خۆشەویستانم، بەڵام فێرنەبووم کە بزانم چۆن سارێژی برینەکانیان بکەم.

## ژیان فێری کردم

ئەگریم بۆ ژیانێک کە دەبێت لە کۆتاییدا جێی بهێڵین.

## ژیان فێری کردم

گلەییو گازندە لە هاوڕێکانم بکەم، بەڵام نازانم کێ شایستەی ئەوەیە ببێتە هاوڕێم.



فرمێســـکی دۆستانم بسڕم، بەڵام نازانم چۆن فرمێسکەکانی خۆم بسڕم.

ژیان فێری کردم

هەموو شتێك لە گەردوونو زەویدا، سنورێکی هەیە.

ژیان فێری کردم

زەردەخەنە بکەم بە ڕووی ئەو کەسانەدا کە گرژو مۆنن، بۆ ئەوەی فێربن چۆن زەردەخەنە بکەن.

ژیان فێری کردم

شکست بریتییە لە ســەرەتای ئەزموون، بۆ تەیکردنو شەقکردنی ڕێگەی سەرکەوتن.

ژیان فێری کردم

بیر لە ڕابــردوو نەکەمــەوە، چونکە ڕابردوو تێپەڕیــوەو هەرگیز ناگەڕێتەوە، فێربووم بۆ ســبەینێ بڕوانم، چونکە پڕە لە ئاواتو هیواو گەشبینیو ئایندەیەکی پرشنگدار.




خەڵکی بە ژیاندا گوزەردەکەن، هەندێکیان حەز دەکەن بگەڕێنەوە بۆ ڕابردوو، هەندێکیشیان حەزدەکەن دنیا جێبهێڵن.

## ژیان فێری کردم

دووربکەومەوە لە گومانو ئیرەیی بردن، چونکە بنەمای تێکدانو لەناوچوونی ژیانو بەختەوەرین!

## ژیان فێری کردم

پێویستە مرۆڤ ئاواتەخواز نەبێت، بارودۆخو گوزەران چاك بێت، بەڵکو پێویستە سەرەتا ئاواتەخوازبێت کە خودی خۆی چاك بێت.

## ژیان فێری کردم

لەگەڵ کەسانی نەفام وتوێژ نەکەم، چونکە پەشیمان دەبمەوە. هەروەها لەگەڵ کەسانی نەزانیشدا وتوێژ نەکەم، چونکە ماندوو دەبم، لەگەڵ درۆزنیشدا هاوڕێیەتی نەکەم، چونکە نەدۆڕێم.






سەرنج لەو ڕاهێنەرانە بدە، کە شێرو پڵنگ لەسەر جۆرەها یاری ڕادەهێنن، بەشێوەیەك وەکو سەگو پشیلەی ماڵییان لێدەکەن، کەواتە تۆش هەمان کار لەسەر نەفسو ئارەزووەکانت ئەنجام بدە!





فرمێســـک، ئەو دڵۆپە ئاوانە نییە کە لە چاوەکانمان دێنە خوارەوە، زۆرێک لە ئێمە پێدەکەنێت، بەڵام دڵی دەگری‌و هاوار دەکات!



خۆشەویستی ڕاستەقینە، ئەو خۆشەویستییەیە کە هەرگیز کۆتایی نایەت، تەنانەت ئەگەر تەمەنیش کۆتایی هات، ئەو هەر دەمێنێت!



لە خەم دوورکەوەرەوە، تا دڵخۆشی‌و ئاسوودەیی لێت نزیک بێتەوە، لە خوای گەورە نزیکبەرەوە، تا خەم‌و پەژارەت لێ دوورکەوێتەوە!

## ژیان فێری کردم

مرۆڤ خۆی دابونەریتەکان دروست دەکات، بەڵام دواتر بیرۆکەکان ئەو دروست دەکەن!

## ژیان فێری کردم

ڕووکەش کاریگەری لەسەر خاوەنەکەی هەیە، ئەو کەسانەش لە هەڵەدان کە وا گومان دەبەن، خەڵکی لە ڕووی ڕووکەشەوە بڕیارمان لەسەر نادەن!





خودی مرۆڤ، زۆرجار دووچاری هێرشـــی توندی هەستە نەرێنییەکان دەبێتەوە، کە مرۆڤ لە ســـەرکەوتن دەوەستێنن، وەکو «شەرمکردن، کێشـــەو گیروگرفتـــەکان، تێکچوونی باری دەروونی، ترســـان، بێ ئارامی، خەوتنی زۆر، ئیرەیی، حەســـوودی... هتـــد»، بەڵام لە بەرامبەردا دەگونجێت ڕووناکی هەستە پۆزەتیفەکان هەڵبێت، وەکو «حەماسەتو گەرموگوڕی، دڵسۆزیو خۆشەویستیو دڵفراوانیو گەشبینیو لێبوردنو ئارامگرتن... هتد»، پێویســـتە خۆمان لەســـەر لایەنـــە پۆزەتیفەکان ڕابهێنین، ئەو کات دەبێت خۆمان بە کەســـێکی خاوەن نرخو پڕبەها دابنێین.

## ژیان فێری کردم

مرۆڤ دەتوانێت هەر شتێک بیەوێت بەدەستی بهێنێت، هەر ئاواتێکی هەیـــە بیهێنێتەدی، بە مەرجێـــک خاوەنی ورەیەکی بـــەرزو پتەو بێت، هەرگیز ئەم ورە بەرزییە لە دەست نەدات! بێگومان خەباتو تێکۆشان لە پێناوی ژیانی ئاسوودەدا، پەیوەستە بە ورەو تواناو ویستو ئیرادەیەکی پۆڵایینەوە، دەبێت ئەوەش بزانین کە ورەبەرزیو هیواو ئاوات، پشوودانو ڕێکەوتن ناناسێت!

# ژیان فێری کردم

بۆئەوەی ببیتە خاوەنی نەریتێك كە هەمیشە لایەنە جوانەكانی ژیان ببینیت، پێویستە لەسەرت سەرەتا چاودێرییەكی وردی ئەو بیرۆكانە بكەیت كە دەیگەیەنیت بە ژێری ناوەكیت، بەردەوام ئەو بیرۆكە پۆزەتیڤانە دووبارە بكەرەوە كە دەتەوێت لە ژێری ناوەكیتدا بیانروێنیت، دووبارەبوونەوەی كردار دەبێتە نەریت، دووبارەكردنەوەی نەریتەكانیش دەبێتە پتەوبوونی زیاتر، هەروەكو چۆن دەزوویەكی باریك دەبێتە كلافەیەكی ئەستورو بەهێز، هەرواش نەرمونیانی‌و گەشبینی، دەبێتە هۆی سەركەوتنی مرۆڤ!




مرۆڤی ژیر كەم قسە دەكات، كاتێكیش قسەی كرد، ڕاستی دەپێكی‌و حەق بەزاریدا دێت.




پێویست ناكات هەموو ئەو شتانە بڵێیت، كە دەیانزانیت، بەڵام پێویستە هەموو ئەو شتانە بزانیت، كە دەتەوێت بیڵێیت.




تەنها دوو ڕێگـــە هەیە بۆئەوەی ببیتە خاوەنـــی بەرزترین باڵەخانە، یان دەبێت هەموو باڵەخانەکانی دەوروبـــەرت بڕوخێنیت، یاخود دەبێت باڵەخانەیەك دروست بکەیت، کە لە هەموو باڵەخانەکانی دەوروبەرت بەرزتر بێت، مرۆڤی زیر، هەمیشە ڕێگەی دووەم دەگرێتەبەر!



هاوسەنگی وا لە مرۆڤ دەکات کە بەردەوام هەست بە بوونی خۆی بکات، مرۆڤی هاوسەنگ بەوپەڕی هێمنیو متمانەبەخۆبوونو سەرکەوتنەوە، ڕووبەڕووی هەموو بارودۆخو هەڵوێستە جیاوازەکان دەبێتەوە، مرۆڤی هاوسەنگ ڕقی لەو ڕۆژە نییە کە دوێنێ خۆشی ویستووە، مرۆڤی هاوسەنگ بەیانیان ڕووخۆش نییەو ئێواران ڕووگرژو تاڵ، مرۆڤی هاوسەنگ هەرگیز تووڕە نابێت، هیچ کات دوودڵو نیگەران نابێت.



هاوسەنگی سەرچاوەی ئارامیو متمانەبەخۆبوونە، کۆنترۆڵکردنی دەروونو زاڵبوونە بەسەر هەواو ئارەزووەکاندا، مرۆڤی هاوسەنگ بارودۆخو ئارەزووەکان ناتوانن دەستی بەسەردا بگرن، بەڵکو ئەو دەتوانێت ڕووبەڕوویان بێتەوەو بەسەریاندا زاڵو سەرکەوتوو بێت.



زۆربەی ئەو کەسانەی مایەپووچ دەبن، ئەو کەسانەن کە حەماسەتو پەرۆشییان بۆ کارەکەیان لە دەست دەدەن!





ئەگــەر خەمێك، یــان گرفتێك ڕووی تێكردیت، لــە تۆ بەهێزترو بە تواناتر بوو، پارێزگاری لە ئارامیو لەســەرخۆییو ڕووخۆشیت بكە، بەتایبەت لەو كاتانەدا كــە دووژمنەكانت واچاوەڕێ دەكەن، كە تۆ شكســت دەهێنیت، لەو كاتەدا بڵێ: بێگومــان ڕۆژی منیش دێت بۆ سەركەوتنو گەیشتن بە هیواو ئاواتەكانم.

## ژیان فێری كردم

بەختی باش، پەیوەستە بە ئەستی مرۆڤەوە، كە پێشوازی لە جۆرەها ئیلهامو بیرۆكــە دەكات، كە مرۆڤ لە تێبینــیو تێڕامانەكانییەوە پێــی دەگات، هەر لە متمانەبەخۆبوونو هیواو ئارەزووی ســەركەوتنو ئارامگرتنو ڕاهاتن لەسەر دژوارییەكانو هەنگاونان بەرەو گۆڕەپانی كاركردنو بەدیهێنانی ئەریتی نوێو توانای خۆگونجاندنو ..هتد، لە كۆتاییشــدا هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو توانایانەی كە لە خودی خۆیدا حەشــاردراوە، كە تەنها خۆی هەستی پێدەكاتو كەسی دی ناتوانێت هەستی پێبكات!

## ژیان فێری کردم

دەستم بکەمەوەو پەنجەکانم والابکەم، پاشان دەستم سەربەرەوخوار هەڵگێڕمەوە، وا بێنمە پێشچاوی خۆم کە ئەوەی لە نێو دەستمدایە بریتییە لە خەمو پەژارەو دڵتەنگیو بیرۆکە ڕەشبینەکان، بە هەڵگەڕانەوەی دەستم دەکەونە خوارەوەو ئیدی لە نێو دەستمدا نامێنن!

## ژیان فێری کردم

ئەگەر مرۆڤ ویستی کارێک ئەنجام بدات، بێگومان دەتوانێت ئەنجامی بدات، بە مەرجێك بیر لە بیرۆکەی ئەرێنیو وشەی ڕووخێنەر نەکاتەوە!

## ژیان فێری کردم

پیاوی خاوەنکاری سەرکەوتوو، ماڵو سامانەکەی بە هۆی تواناو شارەزاییەکانییەوە کۆناکاتەوە، بەڵکو زۆربەی جار بە هۆی هەڵەکانییەوە دەبێتە خاوەن سەروەتو سامان.

## ژیان فێری کردم

هەمیشە بە هەنگاوی یەکەم هەڵسەو ئەو کارەی دەتەوێت ئەنجامی بدەیت، ئەنجامی بدە، دڵنیابە هەموو ترسو دڵەڕاوکێیەك، بە تێپەڕبوونی کات دەڕواتو نامێنێت.






ئەگەر مرۆڤ لە یارییەکدا، یان لە وەرزشێکدا کاتێکی خۆشی بەسەربرد، ئەوا براوەیە، ئەگەرچی ئەنجامەکەشی بدۆڕێنێت!




هیچ شتێکی قورس لەم ژیانەدا بوونی نییە، ئەگەر بکرێتە پارچەی بچووک بچووک!




هیچ مرۆڤێك بەرلەوەی تاقیبکاتەوە نازانێت، چی باشە، یان چ کارێك بکات، یاخود چی بەدەستبهێنێت.




دەتوانیت هاوڕێیەتی گورگ بکەیت، بەو مەرجەی هەمیشە تەوردەکەت ئامادەبێت.






تۆ هاوڕێیەکت هەیە، متمانەی پێدەکەیت.. هاوڕێکەشت هاوڕێیەکی هەیە متمانەی پێدەکات.. هاوڕێی هاوڕێکەشت هاوڕێیەکی هەیە، متمانەی پێی هەیە! کەواتە پارێزگاری لە نهێنییەکانی ژیانت بکەو لای کەس مەیاندرکێنە!





## ژیان فێری کردم

ڕەگەزەکان جیاوازن، بەڵام مرۆڤ یەکە.. کەواتە مەڕوانە بۆ ڕەگەزو ڕەچەڵـــەک، مەڕوانە بۆئەوەی بزانیت خەڵکی کام وڵاتە، بەڵکو بڕوانە بۆ دڵو بیروباوەڕی، تا بزانیت وابەستەی چ بیروباوەڕێکە!

## ژیان فێری کردم

زمـــان کەوچکە، ژیریش دەورییە! چـــۆن دەبێت کەوچک لە دەوری گەورەتر بێت؟!

## ژیان فێری کردم

هیچ مرۆڤێك ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، لەنوێوە دەست بە ژیان بکاتەوە.. بەڵام دەتوانیت، لە ئێســـتاوە دەست پێبکەیتو کۆتاییەکی نوێ دروست بکەیت!

## ژیان فێری کردم

هەر کەس لە دەریای ئەزموونی نەخواردەوە، لە ناو دەریای نەزانیدا لە تینواندا دەخنکێت!




ئەگەر لەسەر کردارێك، کە لە ڕابردوودا ئەنجامت داوە، سەرزەنشتی خۆت کرد، ئەوا بیربکەرەوە تۆ مرۆڤیت، مرۆڤیش شایەنی هەڵەکردنە، بێگومـــان لە ئایندەشـــدا هەڵە دەکەیت! چونکە ناتوانی لە دەســـت مرۆڤ بوونت دەربازبیت، گرنگ ئەوەیە هەڵەکان دووبارە نەکەیتەوە.




ژیان قوتابخانەیەو تۆش لەناویدا خوێندکاریت، فێربووم، کە هەرگیز درۆنەکەم، چونکە ڕۆژێك دادێت لەبەردەمی ئەو کەسانەدا شەرمەزاربم، کە درۆم لەگەڵدا کردوون!




مرۆڤ نازانێت تاموچێژی ســـەرکەوتن چییـــە، ئەگەر چەندجارێك شکســـت نەهێنێت، نازانێت مانای پشـــوودانو حەوانەوە چییە، ئەگەر دووچـــاری ماندووبوونو ئێشو ئازار نەبووبێت، نازانێت دڵخۆشـــی چەند مانایەکی گەورەی هەیە، ئەگەر بە خەم ئاشنا نەبووبێت!






ئەو کەسەی فێڵم لێدەکات، فێڵی لە خۆی کردووە، ئەو کەسەی زیانم پێدەگەیەنێت، زیانی بە خۆی گەیاندووە، ئەو کەسەی دزیم لێدەکات، من ماڵو سامان لە دەست دەدەم، بەڵام ئەو ڕەوشتو ئاکاری جوان لە دەستدەدات!

## ژیان فێری کردم

ناپاکی چەکێکە لە دەستی کەسە لاوازەکاندا، بەڵام تەنها بەهێزەکان دەکوژێت!

## ژیان فێری کردم

ئەو کەسەی سیر بچێنێت، ڕیحانە نادوورێتەوە!

## ژیان فێری کردم

هەر ڕۆژێك بێت تەمەن کۆتایی دێت، بەڵام هەرگیز ئیشوکار کۆتایی نایەت!

## ژیان فێری کردم

ئەو کەسەی دەیەوێت خەڵکی گوێی بۆ بگرن، پێویستە سەرەتا خۆی گوێ لە خەڵکی بگرێت!





# ژیان فێری کردم

زۆر بیر لە هەڵوێستی کەسانی تر مەکەرەوە، گوێ مەدە بە گاڵتەجاڕیو ئەو ئازارانەی لەوانەوە دووچارت دەبن، گرنگ ئەوەیە کە تۆ لە کارو ئامانجەکانت دوورنەکەویتەوە، بۆ تۆ هەزار جار ئەوە باشترە، کە بە میانڕەوییو لەسەرخۆییو متبوون تۆمەتبارت بکەن، وەک لەوەی بە پەلەکارو هەڵەشەو خراپ تێنەگەیشتن، تۆمەتبارت بکەن!





ئەوەی کە ناوی دەنێین بەخت، ئەو واقیعەیە کە تێڕوانینەکانمان بۆی جیاوازە، بەپێی جیاوازی هۆشیاریمان بۆ ڕووداوەکانو هەڵوێستمان بەرامبەریان. هەندێجار کارەساتەکان مایەی سوودو قازانجن، کاتێک وەکو بیرۆکەیەک دەیانگوازینەوە لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیەکی تر.



لە قەیرانو ساتەدژوارەکاندا، پارێزگاری لە نازایەتیو بە جەرگیو هاوسەنگی خۆت بکە، هەرگیز خۆت بە ئامانجی تیری بەرامبەر مەزانە.

## ژیان فێری کردم

لە ئەزموونداا قازانجو زیان هەیە، تاقیکەرەوە، هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە مەبە کە خۆت ئارەزووی دەکەیت.



فێری پشوودان بە، لە هزرو بیرت گەڕێ با پشوو بدات، چونکە دوای ماندووبوونی ڕۆژگار، پێویستە مۆڵەتێکی پشوو بە بیرو هزرو جەستەت بدەیت.



ئەو مرۆڤەی سـەرکەوتنی دەوێت، دەبێـت خۆی بچێتە نێو مەیدانی جەنگو بە هەموو تواناو عەزیمەتو ورەبەرزییەکەوە، بەرەنگاری هەموو ئەو بەربەسـتانە بێتەوە، کە ڕێگـرن لەبەردەمیدا، بەڵام ئەوەت لە یاد نەچێت، کە ناتوانیت ئەم هەڵوێسـتەت هەبێـت، ئەگەر متمانەت بە خۆت لاواز بێت، بۆ بچووکترین تەنگوچەڵەمە بلەرزێیتو لە بەرامبەر یەکەم بەربەسـتا هەڵبێیت، هەمیشـە لە بەرەنگاربوونەوە بترسـیتو بەرامبەر هەموو بەرهەڵستکارییەک نەرمی بنوێنێت!



فێری چاوەڕوانی بەو پەلە لە هاتنەدی ئاواتەکانت مەکە.



ئەگەر لە شتێک ترسایت، بچۆرە ناویەوەو ڕووبەڕووی بەرەوە، چونکە زۆر خۆپاراستن لە کەوتنە نێوی خراپترە.





چاوەڕوانی هەڵەی خۆت بکە، پێشبینی ئازاری بەرامبەرەکەشت بکە، هەروەها پێشبینی هەموو ئەو شتانە لە خەڵکییەوە بکە کە پێتخۆشە، یان پێتناخۆشە، ئەم پێشبینییەش بکە بە مایەی هێزو توانای خۆت!



ئەوەی ناتوانێت بەرامبەر بە دەرزی ئاژنی خەڵکی ئارام بگرێت، کەسێکی هەستیارو هەست ناسکە، چونکە ئەو کەسانەی هەستی بەرامبەر دەرزیئاژن دەکەن، کەسانێکی بیرکۆڵو ناتەواون!

## ژیان فێری کردم

هەر کارێك مرۆڤ پێی هەڵدەستێت، لە بەرامبەردا ئەزموونو سامانی پێدەبەخشرێت، دەتوانیت سوود لە ئەزموونەکانت وەربگریتو ماڵوسامانیش وەکو پاداشتی کاردکەت وەربگریت!




مرۆڤ ناتوانێت ڕووبەڕو ئاسۆی فراوانو نوێ بدۆزێتەوە، ئەگەر خاوەنی ئازایەتیو بوێری نەبێت، بۆ دووركەوتنەوە لە كەنار.




تاكە ڕێگە بۆ شكستی هەر بەڕێوبەرێك، ئەوەیە كە فێربوونی چۆنو كەیو دەسەلآت بەخشین، ڕەتبكاتەوە!




گرنگ نییە، مانگانە چەند دەبەخشیت بەكارمەندەكەت، بەڵكو گرنگ ئەوەیە، كە بوونی ئەو كارمەندە لای تۆ، چەند لەسەرت دەوەستێت.




ڕووداوە ناخۆشەكانی ژیان، مرۆڤ زیاتر لە نزیكەوە بەخۆی دەناسێنێت!




مرۆڤ ئەگەر چاوەڕوانی هەلێک دەکاتو نەهاتە پێش، ئیدی بۆچی هەوڵی بۆنادات!




نارەحەتییەکان، ئەو کارە ترسناکانەن، کاتێک دەیانبینیت، تێڕوانینت لەسەر ئامانجەکانت دووردەخەنەوە!




ئەو گرفتانەی لە ژیاندا ڕووبەڕووت دەبنەوە، ئەوە هەلە ڕاستەقینەکانتن، بۆ ئەوەی باشترین هەوڵو تواناکانت بخەیتەکار.




هەرچەندە لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستیش بیت، بەڵام بە ئاسانی جێتدەهێڵن، ئەگەر وەستایت، یان دانیشتیت لەسەر ڕێگەکەت.





له هانی بەعلەوە فێربووم، یان ڕێگەیەك بدۆزمەوە، یاخود ڕێگەیەك دابهێنم.

ژیان فێری کردم

نابێت مرۆڤ واز لەو شتانە بهێنێت کە ناتوانێت پێی هەڵسێت، چونکە ئەو کارە دەبێتە نەریتێك بۆ وازهێنان لەو کارانەش کە دەتوانێت ئەنجامی بدات.

ژیان فێری کردم

هەر جۆرێك لە جۆرەکانی سەرکەوتن، لە کۆتاییدا دەبێتە ڕێسایەك.

ژیان فێری کردم

ئەگەر دەترسیت قسە مەکە، ئەگەر قسەشت کرد مەترسە.



ئێمە تەنها قسەی ئەو کەسانە بە ڕاست دەزانین کە نایانناسین، چونکە پێشتر هەڵیان نەخەڵەتاندووین.





هەرگیز چاومەبڕە ئەو شـــتانەی ڕێڕەوی بیرکردنەوەت بەرەو هەڵدێر دەبەن‌و ژیینت پڕ دەکەن لە وەهم‌و ڕازیکردنی خەڵک‌و هەڵســـان بەو کارانەی نە بەهایەکیان هەیەو نە بیرۆکەیەکیان لە پشتەوەیە.

ژیان فێری کردم

زەمان ئێسقانی نییە، بەڵام ئێسقان دەشکێنێت.

ژیان فێری کردم

ئێســـتا وەکو جاران گەورە بچـــووك ناخوات، بەڵكـــو خێراكان هێواشەكان دەخۆن.

ژیان فێری کردم

ئەزموون ئەو شانەیەیە، کە ژیان پێمان دەبەخشێت، کاتێك کە قژ بەسەرمانەوە نەما.

# ژیان فێری کردم

ئەگەر حەزدەکەیت بەختیارو خۆشحاڵ بیت، پارێزگاری لە تەندروستیت بکە، ئەگەر حەزدەکەیت، لە ژیاندا بەختەوەربیت، پارێزگاری لە ڕەوشتەبەرزەکانت بکە، ئەگەر حەزدەکەیت هەمیشە زیندو بمێنی لە ژیاندا، پارێزگاری لە زیرەی و بیروهۆشت بکە، ئەگەر حەزدەکەیت ببیتە خاوەنی هەموو ئەو سیفەتانە، ئەوا پارێزگاری لە دینت بکە.




خولەکی ئازار کاتژمێرێکە، کاتژمێری خۆشیش خولەکێکە.




ئەگەر خەڵکی واز لە بەخۆداهەڵدانو زەمکردنی یەکتری بهێنن، زۆرینەی زۆری خەڵك دووچاری بێزمانی دەبن!




نیوەی تەمەن بەسەر دەبەین، بە دوای سەروەتو سەرکەوتنو ناوبانگدا، نیوەکەی تریشی بە شوێن پزیشکدا.




مرۆڤ بە منداڵی گاڵتە بە ژیان دەکات، نازانێت کە گەورەبوو ژیان گاڵتەی پێدەکات!




لێدانە بەهێزەکان، شووشە دەشکێنێت، بەڵام ئاسن پتەوتر دەکات!



- سەرکەوتوو: هەمیشە بیر لە چارسەر دەکاتەوە.

- دۆڕاو: هەمیشە بیر لە گرفت دەکاتەوە.

- سەرکەوتوو: بۆچوونەکانی کۆتاییان پێ نایات.

- دۆڕاو: گازندەکانی کۆتاییان پێ نایات.

- سەرکەوتوو: یارمەتی کەسانی تر دەدات.

- دۆڕاو: لە کەسانی ترەوە، چاوەڕوانی یارمەتییە.

- سەرکەوتوو: بۆ هەموو گرفتێك تێڕوانینو چارسەری لایە.

- دۆڕاو: لە هەموو چارسەرێکدا، گرفتێك دەبینێت.

- سەرکەوتوو: دەڵێت: هەرچەندە چارسەر گرانە. بەڵام مەحاڵ نییە.

- دۆڕاو: دەڵێت: چارسەر لەوانەیە هەبێت. بەڵام دژوارە.

- سەرکەوتوو: هەوڵی بەدەستهێنانی ئاواتو خەونەکانی دەدات.

- دۆڕاو: دۆش داماوە، لە ئاقار ئاواتەکانیو بێ هەوڵە.

- سەرکەوتوو: دەڵێت: هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکە. وەك ئەوەی پێتخۆشە لەگەڵتدا بکرێت.

- دۆڕاو: دەڵێت: گزی لە خەڵك بکە، پێش ئەوەی گزیت لێ بکەن.

- سەرکەوتوو: هیواکانی لە کارکردندا دەبینێتەوە.

- دۆڕاو: لە کاردا هەست بە ئازار دەکات.

- سەرکەوتوو: بیر لە پاشەڕۆژ دەکاتەوەو چاوی لە هێنانەدی ئەو شتانەیە کە گونجاون.

- دۆڕاو: ئەندێشەکانی لای ڕابردووەو بیر لە شتی نەگونجاو دەکاتەوە، لە ئاستی چارەدا درۆنگە.

- سەرکەوتوو: ئەوەی کە دەیەوێت بیڵێت، هەڵی بژاردووە.

- دۆڕاو: ئەوەی کە ئارەزووی دەکات، دەیڵێت.

- سەرکەوتوو: لە گفتوگۆدا بەهێزو لە گفتاردا نەرمونیانە.

- دۆڕاو: لە گفتوگۆدا لاوازو لە گفتاردا توندوتیژە.

- سەرکەوتوو: پابەندە بە ئاکاری جوانو لێبوردەیە بەرامبەر هەڵە بچووکەکان.

- دۆڕاو: هەڵە بچووکەکان گەورە دەکاتو پابەند نابێت بە بەها کۆمەڵایەتییەکانەوە.

- سەرکەوتوو: ڕووداوەکان دروستدەکات.

- دۆڕاو: ڕووداوەکان دروستی دەکەن.

دوای خوێندنەوەی ئەم بەراوردە، دەکرێت لە خۆمان بپرسین:

حەز دەکەین لەگەڵ کامیاندا بین؟





# ژیان فێری کردم

ئاسانە چاودێری هەڵەی کەسانی تر بکەین،

بەڵام ئەستەمە دان بنێین بە هەڵەکانماندا.

١١٠

ئاسانە قسە بکەین پێش ئەوەی بیر بکەینەوە،

بەڵام ئەستەمە بیربکەینەوە پێش ئەوەی قسە بکەین.

ئاسانە پۆزشی ئەو کەسە پەسەند بکەین کە هەڵەی بەرامبەرمان کردووە.. بەڵام ئەستەمە کە پۆزش بهێنینەوە بۆ ئەو کەسەی کە هەڵەمان بەرامبەر کردووە.

ئاسانە یاساو ڕێسا دابنێین.. بەڵام ئەستەمە کە پەیوەست بین پێیانەوە.

ئاسانە ئاهەنگ بگێڕین بۆ سەرکەوتن،

بەڵام ئەستەمە پارێزگاری لە کەرامەتمان بکەین دوای تێکشکان.

ئاسانە مانگمان خۆشبوێت کاتێک کە بە تەواوی دەردەکەوێت،

بەڵام ئەستەمە مانگمان خۆشبوێت کاتێک لێمان ئاوا دەبێت.

ئاسانە دۆڕانو شکست خواردنمان، بەڵام ئەستەمە بۆ جاری دووەم هەستینەوە.

ئاسانە هەموو ڕۆژێک چێژ لە ژیان وەربگرین،

بەڵام ئەستەمە هەست بە نرخی ڕاستەقینەی ژیان بکەین.

ئاسانە بەڵێن بدەین،

بەڵام ئەستەمە بەوەفا بین بەرامبەر بە بەجێهێنانی بەڵێنەکانمان.



ئاسانە ڕەخنە لە کەسانی تر بگرین،

بەڵام ئەستەمە کەموکورییەکانی خۆمان چاك بکەین.

ئاسانە هەڵە بکەین، بەڵام ئەستەمە پەند لە هەڵەکانمان وەربگرین.

ئاسانە خەون بە سەرکەوتنەوە ببینین،

بەڵام ئەستەمە تێبکۆشین بۆ بەدیهێنانی خەونەکانمان.

ئاسانە گومانی خراپ بەرین بە کەسانی تر،

بەڵام ئەستەمە گومانی باشیان پێبەرین.

ئاسانە وەربگرین، بەڵام ئەستەمە ببەخشین.

ئاسانە ئەم پەندانە بخوێنینەوە، بەڵام ئەستەمە کاریان پێ بکەین.





لـــه ئەبراهام (لنكۆڵن)ەوە، وانەی خۆڕاگریو بەردەوامیو عەزیمەتو بەرخودان فێربووم..

سەرنج لە كورتەیەكی ژیانی بدە:

* لە كاری ئازاددا شكستی خوارد، كاتێك تەمەنی «٣١» ساڵ بوو.
* لە هەڵبژاردندا شكستی هێنا، ئەو كات تەمەنی «٣٢» ساڵ بوو.
* جارێكی تر لە تەمەنی «٣٤» ســـاڵیدا، لە كاری ئازاددا شكستی هێنایەوە.



* له تەمەنی «٣٥» ساڵیدا، دەزگیرانەکەی کۆچی دوایی کرد.

* له تەمەنی «٣٦» ساڵیدا، تووشی داڕووخانی دەروونی «إنهیار عصبي» بوو.

* لە تەمەنی «٤٣» ساڵیدا، له هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێسدا شکستی هێنا.

* جارێکی تریش له تەمەنی «٤٦» ساڵیدا، شکستی هێنا.

* بۆ جاری سێیەمیش له تەمەنی «٤٨» ساڵیدا، شکستی هێنا.

* پاشان پێشبڕکێیەکی بۆ گەیشتن به پلەی «سیناتۆر» دۆڕاند.

* بەڵام کاتێك تەمەنی گەیشته «٦٠» ساڵ، بوو به سەرۆکی دوانزەهەمی ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

زۆر گرنگه مرۆڤ بتوانێت شکستەکانی بکاته پەیژەیەك بۆ گەیشتن به سەرکەوتن!

شکست جۆکی پێ دانەداو بەردەوام بێت تا دەگاته ئەو ئامانجانەی نەخشەسازی بۆ کردووە!!



# ژیان فێری کردم ٧

ئەو کەسەی متمانەی بە خۆی هەیە، مانای ئەوەنییە کەسێکی لە خۆباییە، ئەو کەسەی دەگری‌و ئەسرینی چاوەکانی هەڵدەوەرێنێ. مانای ئەوە نییە کە خاوەنی دڵێکی لاوازو بێهێزە، ئەو کەسەی پێدەکەنێت، مانای ئەوە نییە کە خەمو پەژارەی نییە، ئەو کەسەش کە جارێك هەڵەی کرد، مانای ئەوە نییە کە کەسێکی خراپە.






داوا لە دڕك نەکەم بۆنو بەرامی عەترم پێببەخشێت، داوا لە بیابان نەکەم گوڵو ڕێحانەم بۆ بڕوێنێت، داوا لە کەسێك نەکەم خاوەنی هەست نەبێت، گرنگی بە هەستو سۆزم بدات!

## ژیان فێری کردم

ئـــەو بیروباوەڕەی ڕقو کینە دروســـتی دەکات، تۆڵـــە دەیرەوخێنێت، ئەو بیروباوەڕەی ســـۆزو خۆشەویســـتی دروســـتی دەکات، چاکەکردن دەیپارێزێت.

## ژیان فێری کردم

خراپترینی خەڵکی دووجۆرن:

جـــۆری یەکەم: زانایەك کە دینەکەی خۆی دەفرۆشـــێت، بە حاکمی وڵات.

جۆری دووەم: حاکمێك کە دوارۆژی دەفرۆشێت بە دنیا!

## ژیان فێری کردم

مرۆڤی ژیرو هۆشـــمەندو باوەڕدار، ئەو کەسە نییە کە تاوان ناکات، بەڵکو ئەو کەسەیە کە ئەگەر تاوانی کرد، پەشیمان دەبێتەوە.



## ژیان فێری کردم

بەختەوەری پشووی دەروونو دڵنیایىو ئارامی ویژدانە، هەموو مرۆڤێك بەو پێوەرە دەپێورێت!

## ژیان فێری کردم

هەمیشە بە کردەوەکانم ئامۆژگاری خەڵکی بکەم، نەك بە قسەکانم!

## ژیان فێری کردم

جوانترین ساتەکانی ژیان، ئەو ساتانەن کە دەوروبەرت لێت تێدەگەنو برینەکانت سارێژ دەکەن، یان لە کاتی بەڵاو ناڕەحەتىو خەمەکانتدا، دەتوانیت سەرت بخەیتە سەرشانیان!

## ژیان فێری کردم

جیاوازی نێوان مرۆڤی زاناو نەزان، ئەوەیە کە زانا ئاگر دادەگیرسێنێت، بۆئەوەی خۆی پێگەرم بکاتەوە، نەزان ئاگر دادەگیرسێنێت، بۆئەوەی خۆی پێ بسوتێنێت!

## ژیان فێری کردم

زۆر دەگمەنە خۆشی، خاڵی بێت لە ئازار، یاخود ئازار خاڵی بێت لە خۆشی!



هیچ شتێک بەبێ ماندووبوون بەدەستنایەت، تەنها هەژاری نەبێت!




لە نەخۆشییەکانی ئەم شارستانییەتە ئەوەیە، فێڵ و تەڵەکە ناودەنێن زیرەکی، لێکهەڵوەشانی کۆمەڵگە ناودەنێن ئازادی، خراپەکاری ناودەنێن هونەر، ئیستغلالکردنیش ناودەنێن هاوکاری..

١٢٠

## ژیان فێری کردم

زانست بریتی نییە لە زانینی شتێکی نادیارو نەزانراو، بەڵکو بریتییە لە سوودوەرگرتن لە زانست!

## ژیان فێری کردم

ناحەق وەکو ڕێوییەکی فێڵباز وایە، بەڵام حەق وەکو مەڕێکی دەستەمۆ وایە، ئەگەر کۆمەلو پشتیوانی خودا نەبوایە بۆ حەق‌و ڕاستی، ئەوا هەرگیز حەق بەسەر ناحەقدا سەرنەدەکەوت!

## ژیان فێری کردم

نهێنی سەرکەوتن لە ژیاندا، بریتییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ناڕەحەتی‌و کۆسپو تەگەرەکان، بە وێنەی دامەزراوی باڵندەکان لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لە گێژەڵۆکەی بیاباندا!!



# ژیان فێری کردم

ژیانی دنیـــا ســـەرەتاکەی گریانـــە، ناوەڕاســـتەکەی نەهامەتی‌و دەردەسەری‌و ناڕەحەتییە، کۆتاییەکەشی تیاچوونە، لە پاشاندا.. یان بۆ نازونیعمەتێکی هەمیشەیی، یان بۆ سزایەکی هەتاهەتایی.

# ژیان فێری کردم

بـــا هەموو ئاواتێکـــت ئەوە نەبێت دەوڵەمەند بیـــت، یان هەژار بیت، بەڕاســـتی ژیان لە نێوان دەوڵەمەندی‌و هەژاریـــدا، پلەوپایەو مەنزڵگای قەناعەتکارانە.

«قەناعەت لە دەریا دەوڵەمەندترە»!

# ژیان فێری کردم

ئەو صندوقەی پڕ لە گەوهەرو مرواریيە، جێگەی بەردو چەوی تێدا نابێتـــەوە، ئەو دڵەش کـــە پڕ لە حیکمەتو داناییە، جێگەی شـــتی بجووکی تێدا نابێتەوە.






حەقو ناحەق پێکەوە گفتوگۆیان کرد:

ناحەق: من سەرم لە تۆ بڵندترە.

حەق: من پێیەکانم لە تۆ دامەزراوترە.

ناحەق: من لە تۆ بەهێزترم.

حەق: بەڵام من لە تۆ زیاتر دەمێنمەوە.

ناحەق: ئەوەی لەگەڵ مندایە، کەسانی بەهێزو خۆشگوزەرانو دەوڵەمەندن.

حەق: خودای گەورە دەفەرمووێت: «وكذلك جعلنا فى كل قرية أكابر مجرميها ليمكروا فيها وما يمكرون إلا بأنفسهم وما يشعرون»، واتە: «بەو شێوەیە، لە ناو هەموو شارو شارۆچکەیەکدا گەورەترینی تاوانبارانمان بالادەست کردووە، تا پیلانو تەڵەکە بگێڕن تیایدا، «بێئەوەی بزانن» کە: هیچ فێڵو تەڵەکەیەکیش ناکەن، بە زیانی خۆیان تەواو نەبێت، لە کاتێکدا هەست بەوە ناکەن، پیلان دژی خۆیان دەگێڕنو بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە، «بەڵام» هەستی پێناکەن، «چونکە غافڵو بێئاگان کە بەرەو لێواری مەرگ هەنگاو هەڵدەگرنو لە سزای پەروەردگار دەربازنابن».

ناحەق: دەتوانم هەر ئێستا بتکوژمو لەناوت ببەم.

حەق: بەڵام نەوەکانم دەتکوژنەوە، ئەگەر دوای چەند ساڵێکیش بێت.






منداڵو شێت نازانن خەمو پەژارە چییە، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤە زیرەکان، لەوان بەختەوەرترو شادمانترن.

## ژیان فێری کردم

مرۆڤی زیر لە هەموو شتێکدا دەسەڵاتی خودا دەبینێت، لە وردەکاریو رێکوپێکی دروستکراوەکاندا، لە جوانیو قەشەنگی سروشتدا، لە داهێنانی دروستکراوەکاندا، تەنانەت لە سزاو تۆڵەی ستەمکارانیشدا!!

## ژیان فێری کردم

ئەگەر زانست خاوەنەکەی لە خراپەو تاوان دوورنەخاتەوە.. ئەوا نەزانینی کەسێکی نەزان، لە زانستەکەی ئەو باشترە.




پێنووس و کاغەزو بیرۆکەو زۆر خوێندنەوە، شارێگەی مرۆڤە بۆ داهێنان، بە تایبەت کاتێك مرۆڤ پارێزگاری لە کاتەکانی دەکاتو ڕێگەنادات بەبێ سوود بەسەریدا تێپەڕێت!




ئەو مرۆڤەی متمانەو بڕوای بە خۆی هەیەو باوەڕی بە پەروەردگاری هەیە، هەرگیز گوێ نادات بە قسەی خەڵکو گرنگی نادات بە ڕەخنەی کەسانی دۆڕاوو شکستخواردوو، چونکە سروشتی ژیان وەهایە تەنها درەختی بەروبومدار بەردی تێدەگیرێت.

## ژیان فێری کردم

مرۆڤ بەبێ هیواو ئاوات، وەکو لاشە وایە بەبێ ڕۆح، ئەو هیواو ئاواتەش کە نایەتە دی، وەکو ئەو خونچەیە وایە کە وشک دەبێت، پێش ئەوەی مرۆڤ چێژ لە بۆنو بەرامە خۆشەکەی ببینێت.

## ژیان فێری کردم

هەندێک لە خەڵکی زۆر گەورە دەردەکەون، چونکە ئەوانەی دەوریانداون زۆر بچووکن..





# ژیان فێری کردم

عەقڵی فەیلەسوف، دەوڵەت لە هەوادا دروستدەکات، عەقڵی چیرۆکخوان دەوڵەت لەسەر ئاو دروستدەکات، عەقڵی مرۆڤی یاخی‌و سەرکەش، دەوڵەت لەسەر خەزێنەی بارووت دروستدەکات، عەقڵی باوەڕدار دەوڵەت دروستدەکات، ڕەگو ڕیشەی لە زەویدا دامەزراوو چەسپاوە، چڵوپۆپی دەگاتە ئاسمان.



هەمیشە زیاتر لەوەی وەریدەگرم ببەخشم..



هاوڕێ سێ جۆرە.. هاوڕێیەك خۆتی پێ دەڕازێنیتەوە، هاوڕێیەکیش سوودی لێدەبینیت، هاوڕێیەکیش پشتی پێدەبەستیت، ئەگەر وێنەی ئەم سێ جۆرە هاوڕێیەت دەستکەوت، ئیدی بە دوای کەسی تردا مەگەڕێ، چونکە لەوە باشترت دەستناکەوێت!



# ژیان فێری کردم

بەرامبەر بە هیچ کەسێك ڕقو کینە لە دڵ مەگرە، چونکە ڕقو کینە زیاتر لە دوژمن زبەرت پێدەگەیەنێت، ڕقو کینە هاوڕێکانت لێ دووردەخاتەوەو دوژمنەکانیشت لێ نزیك دەکاتەوە، خراپەو نهێنییە شاراوەکانت ئاشکرا دەکات، لە ڕیزی ژێرمەندانەوە دەتگوێزێتەوە بۆ ڕیزی دەبەنگو نەزانەکان، وات لێدەکات بە دڵێکی ڕەشو ڕووخساری زەردو خەماوییەوە بژیت..

گفتوگۆی نێوان مەڕو گورگ

گورگ بە مەڕی گوت: متمانەم پێ بکە، دەتبەم بۆ لەوەڕگەیەکی زۆرخۆش.

مەڕەکە وتی: بە چاوی خۆم لێسقانی هاوڕێکانم بینیوە!

گورگەکە وتی: ئەوانە من نەمخواردوون، گورگەکانی تر ئەو کارانەیان کردووە..

مەڕەکە وتی: ئایا تۆ لە سروشتی گورگی خۆت داماڵراویت، تا ئەو کارە نەکەیت کە ئەوان کردوویانە؟!!



ستەم سێ جۆرە، ستەمێك مرۆڤ لە خودی خۆی دەكات، ئەوەیە كە ئامۆژگاری خۆی ناكات، ستەمی مرۆڤیش لە نەتەوەكەی، ئەوەیە كە خزمەتی ناكات، ستەمی مرۆڤ لە ڕاستەقینە ئەوەیە كە دان بە پەروەردگاریدا نەنێت! هاوەڵ دانانیش بۆ خودا، گەورەترین ستەمە!

## ژیان فێری كردم

هەستو سۆز دەوڵەت بنیات دەنێت، هزروهۆشو ژیری پتەوی دەكات، هەواو ئارەزوو دەیڕوخێنێت.






مرۆڤی سەرکەوتوو، ئەو کەسەیە کە دەمی دادەخات، پێش ئەوەی خەڵکی گوێچکەیان دابخەن، گوێچکەکانی دەکاتەوە پێش ئەوەی خەڵکی دەمیان بکەنەوە.

## ژیان فێری کردم

زۆرێك لە ئێمە كاتێكــی زۆر بەفیرۆ دەدەین بە گفتوگۆ لەبارەی بابەتە سادەو ســاكارەكانەوە، چونكە كەمێكمان زانیاریمان هەیە لەسەر بابەتە گرنگو چارەنوسسازەكان.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر خاوەنی دوو كولێرە بوویت، یەكێكیان بخۆو ئەوی دیكەیان ببەخشە!

## ژیان فێری کردم

ئەگەر گەیشــتیتە لوتكە، ســەیری دامێنی چیــا بكە، بۆئەوەی ببینیتو بزانیت كێ یارمەتی داویت بۆ ســەركەوتن، هەروەها ســەیری ئاسمان بكە، بۆئەوەی خودا هەمیشە پێیەكانت لەسەر لوتكە دامەزراوو جێگیر بكات.



## ژیان فێری کردم

ئەگەر دووژمنیشت ڕاوێژی پێکردیت، ئامۆژگاری پێشکەش بکە، لەبەرئەوەی ڕاوێژو ئامۆژگاریکردن، دووژمنت بۆ دەکاتە دۆست.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر دوو سـەگ لەسەر نێچیرێك شەڕیان بوو، ئەوا نێچیرەکەیان ئەو گورگە دەیخوات، کە دێت بەدەم هاوارو وەڕینەکەیانەوە.

## ژیان فێری کردم

گفتوگۆو جەلەجانێ نە لەگەڵ کەسی ڕەوانبێژدا بکە، نە لەگەڵ کەسـی نەزاندا، چونکە کەسی ڕەوانبێژ بەسـەرتدا سەردەکەوێت، کەسی نەزانیش ئازارت دەدات.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر تووڕەبوویتو قسەت کرد، ئەوا قسەیەك دەکەیت کە بەدرێژایی ژیانت لێی پەشیمانیت.




هەر کەس متمانەی بە خودا هەبێت لە هەموو کەس بێ نیاز دەبێت، هەر کەس بەڕاستی پشت بە خودا ببەستێت بەسییەتی، هەر کەس بەڕاستی لە خودا بترسێ، هەموو ترسێکی لەسەر کەم دەبێتەوە، هەر کەسیش بە باشی خودای ناسی، شارەزایی‌و زانیاری تەواوی دەبێت.




خەڵکی دووجۆرن، هەندێکیان جەستەیان نەخۆشەو دڵیان تەندروستو سەلامەتە، هەندێکیشیان جەستەیان تەندروستو سەلامەتەو دڵیان نەخۆشە، ژمارەی ئەو کەسانە زۆر کەمن کە دڵو جەستەیان پێکەوە تەندروستو سەلامەتە.




ئەگەر خەڵکی وەسفو ستایشی کەسێکیان کرد، کەمێکیان ڕاست دەکەن، بەڵام ئەگەر زەمیان کرد، هەموویان ڕاست دەکەن..

# ژیان فێری کردم

ئاکارو ڕەوشـــتی جوان زۆرێك لە هەڵەکانت دادەپۆشێت، هەروەکو چۆن ڕەوشتو ئاکاری ناشیرین، زۆرێك لە چاکەکانت دادەپۆشێت.

# ژیان فێری کردم

زۆرێـــك لە خەڵکی لە نێو ماڵو خێزانیاندا تورەو توندوتیژو دڵڕەقن، بەڵام لە دەرەوەو لەگەڵ خەڵکیدا، نەرمو نیانو لەسەرخۆو قسەخۆشن.

# ژیان فێری کردم

ئێمە وەکو منداڵ واین، ڕقمان لە حەقو ڕاستییە، هەروەکو چۆن منداڵ ڕقی لە دەرمانە، چونکە منداڵ بیر لە شـــیرینیو خۆشی چاکبوونەوە ناکاتەوە بە هۆی دەرمانەوە، بەڵکو بیر لە تاڵی دەرمانەکە دەکاتەوە، هەروەها ئاحەقمان خۆشدەوێت، چونکە حەز لە تامو چێژەکەی دەکەین، بیر لە ژەهرەکەی ناکەینەوە.




هەر کەس بە دووڕوویی بژی، بەبێ ڕوو دەمرێت..

## ژیان فێری کردم

هەرگیز لە چاکەکردن پەشیمان مەبەرەوە، ئەگەرچی ئەو کەسەی چاکەشت لەگەڵدا کردووە، ئەو خراپەی لەگەڵدا کردوویت، چونکە هەمیشە چاکەکردنی تۆو خراپەی ئەوان، باشترو چاکترە لەوەی خراپە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەیت، کە خراپەیان لەگەڵدا کردوویت.




لە چوار کاتدا ئاکارو ڕەوشتی مرۆڤ دەردەکەوێت:-

سەفەر..

زیندان..

نەخۆشی..

کێشەو ناکۆکی.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر خەڵکی تەنها لە بارەی ئەو شــتانەوە قسەیان بکردایە کە دەیزانــن، ئەوا زۆربەی شــوێنەکان ئارامیو بێدەنگی، باڵی بەســەردا دەکێشان.

## ژیان فێری کردم

دەوڵەت بە ســێ شت ئارامو پێشکەوتوو دەبێت، ئاینی ڕاستو دروست، سیاسەتی حەکیمانە، ئابورییەکی بەهێز.

## ژیان فێری کردم

لە نەخۆشــخانە: لە لای ڕاســت دایکو باوکێك دەبینی بڕوانامەی لــە دایکبوون بۆ منداڵە تازە لــە دایکبووەکەیان دەردەهێنن، لە لای چەپــەوە دایکو باوکێکــی دی دەبینی، بڕوانامەی مــردن بۆ منداڵە کۆچکردووەکەیان دەردەهێنن.. «ئەوش دیمەنی ڕاستەقینەی ژیانە».

# ژیان فێری کردم

هەمیشە سێ شتی دراوسێکەت بشارەوە، عەیبو عارو عەورەتی، سەروەتو سامانی، شکستو کەوتنی، لە بەرامبەردا سێ شتی بۆ بڵاوبکەرەوە، ڕێزو چاکەکانی، ئاکارو ڕەوشتی جوانی، سۆزو خۆشەویستیو وەفاداری.



## ژیان فێری کردم

هەرگیز وەسفی هیچ کەس مەکە بە وەرعو خواپەرستی، تا ئەو کاتەی بە ماڵو سامان تاقی دەکەیتەوە، هیچ کات وەسفی کەس مەکە بە بەخشندەیی، تا ئەو کاتەی دەیبینیت بەشداری کارەساتو مەینەتییەکان دەکات، وەسفی هیچ کەس مەکە بە زانستو زانیاری، تا ئەو کاتەی دەیبینی چارەسەری کێشەو گرفتەکان دەکات، وەسفی کەس مەکە بە ڕەوشتو ئاکاری جوان، تا تێکەڵاوی نەبیت، وەسفی کەس مەکە بە لەسەرخۆییو ئارامگریی، تا ئەو ساتەی تووڕە دەبێت، لە کۆتاییدا وەسفی کەس مەکە بە ژیریو هۆشمەندی، تا ئەو کاتەی تاقی دەکەیتەوە.

## ژیان فێری کردم

لەبەر ستەمکارێك پەنا بۆ ستەمکارێکی دیکە مەبە، نەبادا ببیتە نێچیری هەردووکیان.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر دەتەوێت خەڵکی لێت ببورن، ئەوا سەرەتا خۆت لێبووردەبە.

## ژیان فێری کردم

بترسە لە کەسانی خانەدانو بەڕێز، ئەگەر سوکایەتیت پێکردن، بترسە لە کەسانی بێڕێز، ئەگەر ڕێزت لێگرتن، بترسە لە ژیرو هۆشمەند، ئەگەر ئیحراجت کردن، بترسە لە گێلو نەفام، ئەگەر بەزەییت پێیاندا هاتەوە..

## ژیان فێری کردم

ئەو کەسانەی لەو باوەڕەدان کە ماڵو سامان هەموو شتێکە، لە پێناوی بەدەستهێنانیدا هەموو شتێک دەکەن.

## ژیان فێری کردم

هاوڕێی خراپ وەکو ئاگر وایە، هەندێکیان هەندێکی تریان دەسوتێنن.

## ژیان فێری کردم

هەندێجار منداڵەکانمان قسەی نەشیاوو نابەجێ دەکەن، سەرسام مەبە، چونکە خۆمان، یان دەوروبەرمان لەبەردەمیاندا ئەو جۆرە قسانەمان کردووە.



## ژیان فێری کردم

ئەگەر ویستت هاوکاری کەسێک بکەیت، ڕێگە مەدە شکست بهێنێت، زۆر باشترە لەوەی دوای شکست هاوکاری بکەیت.



نەمری پەیامبەر، بە پەیامەکەی‌و نەمری زانا، بە زانستەکەی‌و نەمری فەیلەسوف، بە تێڕامان‌و بیرکردنەوەی‌و نەمری سەرکردە، بە جەنگە ڕزگاریخوازەکانی‌و نەمری چاکسازیش، بە هاوڕێکانیەوەیەتی.

## ژیان فێری کردم

ئەو کەسانەی لە زریاندا لە دایک دەبن، لە ڕەشەبا ناترسن.

## ژیان فێری کردم

هیچ کەسێک دۆڕاوو شکستخواردوو نییە، بەڵام کەسانێک هەن دەکەونە چاڵێکەوەو تیایدا دەمێننەوە.



# ژیان فێری کردم

غەریزەو ئارەزووەکانی مرۆڤ ناسڕێتەوە، بەڵکو ڕامیان دەهێنێت،
پەروەردەش سروشتی مرۆڤ ناگۆڕێت، بەڵکو دەروونی مرۆڤ
پاکدەکاتەوەو پەروەردەی دەکات!



## ژیان فێری کردم

ئەگەر هەواو ئارەزوو نەبووایە، ئەوا هەموو سەرزەمین چاکەخوازو چاکەکار دەبوون، ئەگەر هەموو سەرزەمینیش چاکەکارو چاکەخواز بوونایە، ئەوا کەس شایستەی مردن نەدەبوو، ئەگەر هەموو خەڵکیش بەردەوام لە ژیاندا بوونایەو کەس کۆچی دوایی نەکردایە، ئەوا سەرزەمین جێگەی مرۆڤەکان نەدەبووەوە!

## ژیان فێری کردم

ئەگەر هیواو ئاوات نەبووایە، مرۆڤ کاری نەدەکرد، هیواو ئاوات یەکێکە لە بەخششە گەورەکانی خودای گەورە، کە ئێمەی مرۆڤ نایبینین‌و قەدری نازانین!

## ژیان فێری کردم

بەختەوەرترین دڵ، ئەو دڵەیە کە لە پێناوی کەسانی دیدا لێدەدات.

## ژیان فێری کردم

هەرگیز هاوڕێیەتی کەسی لە خۆبایی مەکە، لەبەرئەوەی ئەگەر چاکەیەکی لێببینێت، دەڵێت من فێرم کرد، خۆئەگەر خراپەیەکت لێدەرکەوت، دەڵێت ئاوانی خۆیەتی!

## ژیان فێری کردم

چوار شت بەڵگەن لەسەربوونی خودای بە دەسەڵاتو بە توانا:
دروستکردنی ژیری لە مرۆڤدا، دروستکردنی دیمەنی جوانی سروشتو بوونەوەر، وردەکاری یاسای ئەم گەردونە گەورەو فراوانە، دادپەروەری لە تۆڵەسەندنەوە لە خراپەکارانو ستەمکاران!

## ژیان فێری کردم

جوانی رۆح نارەحەتییەکانمان لەسەر سووک دەکات، جوانی دەروون، داواکارییەکانمان بۆ ئاسان دەکات، جوانی ژیری، دەستکەوتو ئاواتەکانمان بۆ دێنێتە دی، جوانی شێوەو رووخسار دەبێتە هۆی ماندووبوونمان.

## ژیان فێری کردم

بیرۆکە رۆحییەکانمان، خۆشیو شادییەکانمان بۆ دروستدەکەن، کە هەرگیز کۆتایی نایەت، بیرۆکە مادییەکانیش ئەوەندە داواکاریمان بۆ دروستدەکەن، کە هەرگیز کۆتاییان نایەت، زۆربەشیان نایەنە دی!



# ژیان فێری کردم

هەرگیز بە تامی خۆشـــی خواردن فریو مەخۆ، تا ئەو کاتەی سوودەکانی ئەو خواردنەت بۆ دەردەکەوێت، بە گریانی کەسانی دونیا نەویست فریو مەخۆ، تا بۆت دەردەکەوێت کە بەردەوامە لەسەر دونیا نەویستییەکەی، بە بانگەوازو بانگەشەی هیچ زانایەك فریو مەخۆ، تا نزیکەکانی گەواهی بۆ دەدەن، بە پاڕانەوەو خۆبەداماو زانینـــی هیچ ئافرەتێك فریو مەخۆ، تا گوێ بۆ هاوســـەردکەی دەگریت! بە نوێژی هیچ خواپەرســـتێك فریو مەخۆ، تا مامەڵەو هەڵسوکەوتی دەبینی، بە حەماسەتو گڕوتینی هیچ لاوێك فریو مەخۆ، تا بە ناڕەحەتیو ناخۆشیدا تێدەپەڕێت، بە بانگەشەی هیچ کەس فریو مەخۆ کە لافوگەزازی نیشـــتمانپەروەری لێدەدات، تا دەبێتە وەزیر، یان کاربەدەســـتێکی باڵا، بە سوێندی فرۆشیار فریو مەخۆ، تا حەزو ئارەزووی بـــۆ کڕینی کەلوپەلی بەرامبەر دەردەکەوێت!

# ژیان فێری کردم

چاوە برسییەکان زۆر زیانبەخشترن لە سکە برسییەکان، چونکە هەر کات سك خواردنت پێدا، تێردەبێت، بەڵام چاو هەرچەندێك بخوات، برسی تر دەبێت!

# ٧
# ژیان فێری کردم

ئەگەر لەگەڵ حەکیمێك دانیشتی، زۆر بەجوانی گوێ بۆ وتەکانی بگرە، ئەگەر لەگەڵ کەسێکی ژیرو خاوەن ئەزموون دانیشتی، قسەی لەگەڵدا بکە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ زۆر بلێیەکی بێ ئەزموون دانیشتی، هەر زوو هەستەو جێی بهێڵە، ئەگەرنا ئەتکوژێ!



## ژیان فێری کردم

سەرکەوتن تەنها بە سێ شت دەبێت: ناسینی دوژمن، تۆکمەو پتەوی پلان، کۆکردنەوەو یەکخستنی تواناکان.

## ژیان فێری کردم

ئەو سیاسەتمەدارەی بە سوپاسکردن دڵخۆش دەبێت، بە ڕەخنەگرتن بێزارو توڕە دەبێت، بە چەپڵەی لایەنگرانو دۆستانی خۆشحاڵو شاگەشکە دەبێت، بە فیکەو ناڕەزایی نەیارانی بێسنور توڕە دەبێت، ئەوە سیاسەتمەدارێکی سەرنەکەوتووە!

## ژیان فێری کردم

ئەو سیاسەتمەدارەی تەنها پشت بە جەماوەر دەبەستێت، سیاسەتمەدارێکی دەستبڕو درۆزنە، ئەو سیاسەتمەدارەی تەنها پشت بە ڕۆشنبیران دەبەستێت، سیاسەتمەدارێکی دۆڕاوە، سیاسەتمەداری سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە دەتوانێت جەماوەرو ڕۆشنبیران لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە!

## ژیان فێری کردم

لە شەڕدا پێویستە سۆزو خۆشەویستی بەهێزتربێت لە عەقڵ، لە سیاسەتدا پێویستە عەقڵ بەهێزتربێت لە سۆزو خۆشەویستی، لە ماڵدا پێویستە هاوسەنگی بکەیت لە نێوان عەقڵو سۆزدا، لە خۆشەویستیدا جێگەیەك بۆ عەقڵ بوونی نییە!

## ژیان فێری کردم

ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەمووشتێك دەزانێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە هیچ شتێك نازانێت.

## ژیان فێری کردم

خەڵکی لە کارکرندا سێ جۆرن، یەکەمیان تەنها بیر لە بەرژەوەندی گشتی دەکاتەوەو هەمیشە بەرژەوەندی خۆی فەرامۆش دەکات، ئەمە بەڕێزترین جۆری خەڵکییە، دووەمیان لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی بیرێکیش لە بەرژەوەندی خۆی دەکاتەوە، واتە هاوسەنگییەك دروستدەکات لە نێوان بەرژەوەندی گشتیو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا، ئەمجۆرەش کەسانێکی بەخشندەن، سێیەمیان تەنها بیر لە بەرژەوەندی خۆی دەکاتەوەو هەرگیز لە بیری بەرژەوەندی گشتیدا نییە، ئەمەش خراپترین جۆری خەڵکە!



## ژیان فێری کردم

ناپاکی بریتییە لە جێبەجێکردنی مەرامو ئامانجەکانی دووژمن، ئەگەرچی ڕێکەوتنیشی لەگەڵدا نەکرابێت!

## ژیان فێری کردم

شکستەکانت بکە بە پەیژەیەك بۆ سەرکەوتن، دۆڕانەکانت بکە بە ڕێگەیەك بۆ بردنەوە، ستەملێکردنت بکە بە هۆکارێك بۆ ئازادبوون، کۆتوپێوەندیش بکە بە هاندەرێك بۆ ڕزگاربوون!

## ژیان فێری کردم

گەورەترین پشتیوان بۆ ملهوڕو ستەمکاران، بێدەنگی چاکەخوازو دڵسۆزانەو قسەکردنی کەسانی دووڕو خراپەکارانە..

## ژیان فێری کردم

گەشبینو ڕەشبین هەردوو کیان دوو کەسایەتی پێویستن بۆ مرۆڤایەتی، چونکە گەشبین فڕۆکە دادەهێنێتو ڕەشبینیش پەڕەشووت دروست دەکات.




بەسوودترینو باشترین سەروەتو سامان کە بۆ منداڵەکانی جێدەهێڵیت، ئەوەیە کە بە باشی پەروەردەیان بکەیتو زانستو زانیارییان فێر بکەیت، باشترین شوێنەواریش کە دوای مردنت خەڵکی سوودی لێدەبینن، زانستو زانیاریتو ئەو خزمەتەیە کە لە ماوەی تەمەنیدا پێشکەشی خەڵکیت کردووە.

# ژیان فێری کردم

کاتێـــك دەڵێیت: نیوەی کۆمەڵگە خراپە، هەموو کۆمەڵگە لێت تورەو قەڵس دەبن، خۆئەگەر بڵێی نیوەی کۆمەڵگە باشو سەرکەوتوون، هەمووان خۆیان بە نیوە باشـــەکە دەزانن‌و بە دەربڕینەکەت خۆشحاڵ دەبن.. «لە کاتێکدا هەر دوو دەستەواژەکە یەك مانایان هەیە».

# ژیان فێری کردم

کاتێك کەســێکی بەڕێزو خاوەن ئاکاری جوان دەبینیت، لەگەڵ کەســێکی خراپو ئاکار ناشیرین ڕاوەستاوە، دەستبەجێ دەڵێیت: ئەو کەســـە بەڕێزەش خراپ بوو، ناڵێیت: ڕەنگە ئەو کەسە خراپە سبەی بە هۆی هاوڕێیەتی ئەم کەسە چاکەوە بگەڕێتەوەو ببێتە کەسێکی بەڕێزو ئاکارجوان! ئێمە کەی دەگەینە ئەو ئاستەی لە بری گومانی خراپ، گومانی باش بە خەڵکی ببەین؟! «ئەوەش واقیعی ژیانمانە».

# ژیان فێری کردم

پیاوی ژیر دەڵێت: مـــن ئافرەتێك بەرهەمی هێنـــاوم، کە دایکمە، ئافرەتێك فێری کردووم، مامۆستامە، هاوسەرگیریم لەگەڵ ئافرەتێکدا کردووەو بووەتە هاوبەشـــی ژیانم.. کەواتە چۆن ڕێز لە ئافرەت نەگرم؟ لـــە کاتێکدا ئافرەتە دایکم، ئافرەتە مامۆســـتام، ئافرەتە هاوســـەرو هاوبەشی ژیانم؟! «ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە»!

# ژیان فێری کردم

ئەگەر کوڕێك هاتە خازوێنی کچەکەت، دیارە لە ئاکارو ڕەوشتی ڕازییە، کەواتە تۆش پرســـیاری سەروەتو ســـامانی لێ مەکە، بەڵکو پرســـیاری ئاکارو ڕەوشتی جوانو پەروەردەی دروستی لێ بکە، چونکە پارەو ســـامان مـــرۆڤ بەختەوەر نـــاکات، هەروەها بەدەستهێنانیشـــی ئاســـتەم نییە، بەڵام پەروەردەو ئاکاری جوان، مرۆڤ بەختەوەر دەکاتو بەدەستهێنانیشی سەختترە لە پارەو سامان!



## ژیان فێری کردم

ئەگەر لە ژیاندا خاوەنی چاکەیەکی وەهانیت کە دوای مردنت سودت پێ بگەیەنێت، ئەوا هەوڵبدە خاوەنی تاوانو خراپەیەکی وەهاش مەبە کە دوای مردنت زیانت پێ بگەیەنێت.. «تکایە زۆر بە جوانی بیری لێ بکەرەوە».

## ژیان فێری کردم

ئەگەر ویستمان سەرکەوتنو پێشکەوتن بە دەستبهێنین، دەبێت ڕێز لە مامۆستاکانمان بگرین، ڕۆژێك پرسیار لە سەرۆك وەزیرانی یابان کرا، سەبارەت بە نهێنی پێشکەوتنیان لە ڕووی تەکنەلۆژیاوە، لە وەڵامدا وتی: ئێمە موچەی مامۆستامان گەیاندە ئاستی موچەی وەزیر، حەسانەی دبلۆماسیمان بە مامۆستا بەخشی، ڕێزو شکۆی سەرۆکمان لێگرت!

## ژیان فێری کردم

بە ناپاکیو ستەمی کەسە نزیکەکانمان سەرسام نەبینو دووچاری شۆك نەبین، چونکە لە پێش ئێمەدا «یوسف» سەلامی خودای لێبێت، براکانی ستەمیان لێکردو ناپاکیان لەگەڵدا کرد، لە کاتێکدا ئەو «پەیامبەر» بوو!




لە منداڵیمدا لە هەر شوێنێکی ماڵەکە خەوم لێ بکەوتایە، کاتێک لە خەو هەڵدەستام، لەسەر جێگەی نووستنەکەم بووم.. ئەوەش سۆزو بەزەیی دایکو باوکم بوو.. «خودایە بەزەییت بە دایکو باوکمدا بێتەوە، هەروەکو ئەوان چۆن بە منداڵی بەزەییان بە مندا هاتەوە».. ئەوەش جوانترین یادەوەرییەکانی منداڵیمە.



# ژیان فێری کردم

هەر کەس ماڵو دارایی کەم بوودوە، خەمو پەژاردی زیاد دەکات، هەر کەس زانستو زانیاری زیادی کرد، خەموپەژاردی کەم ددکات، کەواتە بە زیادکردنی زانســتو زانیاری، خەمەکانت کەم بکەردوە. باشــترە لەودی بە زۆرکردنی ماڵو سامان خەمەکانت کەم بکەیتەوە، چونکە زۆر ددگمەنــە دەوڵەمەند لە نەهامەتی پارێزراو بێت، زۆر ددگمەنیشــە زانایــەك بکەوێتە نێو نەهامەتیو ناڕەحەتییەوە، زۆر ددگمەنە مرۆڤێك ببینــی خاودنی زانســتو زانیاری زۆرو ماڵو ســامانی زۆر بێت، لەگەڵ ئەوەشدا سەلامەت بێت لە ناڕەحەتیو نەهامەتی، لە هەمان کاتدا دەستی لــە خێرو چاکەدا هەبێت، لە مێژوودا نموونەی زۆرێك لەو کەســانەم خوێندۆتەوە.

# ژیان فێری کردم

نە لە خۆشەویســتیو نە لە ڕقو کینەدا، زیادڕەویی نەکەم، چونکە لەوانەیە دۆســتی ئەمڕۆ دوژمنی ســبەینێ بێت، یاخــود دوژمنی ئەمڕۆ دۆستی سبەینێ بێت..

## ژیان فێری کردم

مامەڵە لەگەڵ قــەدەردا بکە، بە ڕەزامەندی، لەگەڵ خەڵکیدا بە وریاییــەوە، لەگەڵ کەس‌و کارت بە نەرم‌و نیانی، لەگەڵ براکانت بە لێبوردن، مامەڵە لەگەڵ بارودۆخدا بکە بە چاوەڕوانی هەڵگەڕانەوەی بارودۆخ، بەمجۆرە دەتوانیت دەروونت لە ڕووخان‌و لەناوچوون بپارێزیت.

## ژیان فێری کردم

هاوڕێیەتی کەسانی دەستبڵاو مەکە، چونکە ماڵ‌و سامانت بە هەدەر دەبەن، هاوڕێیەتی کەسانی بەخیل‌و ڕەزیل مەکە، چونکە کەسایەتی‌و پیاوەتیت لەناودەبەن.

## ژیان فێری کردم

زۆر ئاســانە دەنــگ بــۆ بڕیارێك بدەیــن، بەڵام ئاســتەمە کار بۆ جێبەجێکردنی بکەین.



## ژیان فێری کردم

مامناوەندبە، لە ژیانو گوزەرانو خواردنتدا، هەروەها لە خۆشیو خەمو کارکردنو پشوودانیشـــتدا مامناوەندبە، لە ڕێگریو بەخشـــینتدا، لە خۆشەویســـتیو ڕقلێبوونتدا مامناوەندبە، ئەوا دڵنیابە هەرگیز نازانیت نەخۆشی چییە.

## ژیان فێری کردم

هاوڕێیەتی نـــەزانو نەفام، وەکو هاوڕێیەتی مـــار وایە، نازانی کەی پێوەت دەدات!

## ژیان فێری کردم

خۆبەکەمزانین سەرت بەرزدەکاتەوە، خۆبەگەورەزانینیش سەرت نزم دەکاتەوە.

## ژیان فێری کردم

بڕوا بە سۆزو بەزەیی مرۆڤ مەکە، تا ئەو کاتەی لە ڕۆژانی ناخۆشیو نارەحەتیدا هەڵوێستی دەردەکەوێت.

## ژیان فێری کردم

زیرەکەکان لەسەر حسابی ڕۆحیان ژیریان بەهێزدەکەن، نەفامو نەزانەکان لەسەر حسابی ژیریان جەستەیان بەهێزدەکەن، چاکەکاران لەسەر حسابی ژیریان ڕۆحیان بەهێزدەکەن، ڕاستگۆکانیش لە یەك کاتدا پێکەوە ژیریو ڕۆحیان بەهێز دەکەن!

## ژیان فێری کردم

ئێمە عەیبەمان لا گەورەترە لە حەرام، ئێمە کۆمەڵگەیەکین زیاتر لە دروستکار، لە دروستکراو دەترسین!






هەر کەسێك ماڵەکەی بەکارهێنا، بۆ پاراستنی ڕێزو کەرامەتی، ئەوە کەسێکی ژیرە، هەرکەس هەوڵیدا بۆ زیادکردنی هاوڕێی باش، ئەوە حەکیمە، هەرکەس هەوڵیدا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا، ئەوە کەسێکی چاکەکارە، خودای گەورەش دەفەرموێت: (إن الله قریب من المحسنین).. بەڕاستی خودای گەورە لە چاکەکارانەوە نزیکە..





ئەگەر بە تورەییەوە بە لێدانێکی سوک لە منداڵێک بدەیتو سەرزەنشتی بکەیت، منداڵەکە دەگریت، بەڵام ئەگەر زۆر بە توندی لە هەمان منداڵ بدەیتو بە دەمییەوە پێ بکەنی، وەکو ئەوەی گاڵتەی لەگەڵدا دەکەیت، ئەوا لە بری گریان پێدەکەنێت. چونکە ئازاری دەروونی قورسترە لە ئازاری جەستەیی، هەندێک وشەو دەربڕین، دڵ بریندار دەکەن!

## ژیان فێری کردم

تەنها لە یەک درەخت دەتوانیت یەک ملیۆن دەنکە شقارتە دروست بکەیت، بەڵام دەگونجێت یەک دەنکە شقارتە ببێتە هۆی سوتانی یەک ملیۆن درەخت.. کەواتە ڕێگە مەدە تەنها یەک هەڵوێستی تورەبوونت، وێنەت لە بەرچاوی هەموو خەڵکی بسووتێنێت..

## ژیان فێری کردم

هەمیشە گومانی باش ببەم بە خەڵکی.. جارێکیان دەوڵەمەندێک هەستیکرد، کرێکارێکی هەژار لە پشتییەوە ڕێدەکات، لەبەرخۆیەوە وتی: ئەوانە کەسانێکی چاوچنۆڵنو سواڵکەرن، هەمیشە بە دوامانەوەن بۆئەوەی شتێکیان پێبدەین.. لەو کاتەدا کرێکارەکە وتی: ببورە قوربان جزدانەکەت لێکەوتە خوارەوە، بفەرموو.. ئەوە جزدانەکەتە!






براکانی پێغەمبەر یوسف «سەلامی خوای لێبێت»، ویستیان بیکوژن، «بەڵام نەمرد».. پاشان ویستیان شوێنەواری بسڕنەوە، «خودای گەورە پلەو پایەی بەرزکردەوە».. پاشان فرۆشتیان بۆئەوەی ببێتە کۆیلە، «خودای گەورە کردییە پاشا». پاشان ویستیان خۆشەویستی لە دڵی باوکیدا بسڕنەوە «بە پێچەوانەوە خۆشەویستی لە دڵی باوکیدا زیاتر بوو».. «کەواتە لە فێڵو تەڵەکەو پیلانی خەڵکی نیگەران مەبە، ویستی خودای گەورە، لەسەرو ویستی هەموو کەسێکەوەیە»..

## ژیان فێری کردم

سێ جۆر هاوڕێ هەیە: هاوڕێیەك دڵو گیرفانیت بۆ دەکاتەوەو پێداگری دەکات لەسەر بەکارهێنانی، هاوڕێیەکیش تەنها دڵت بۆ دەکاتەوە، تۆش سوودی لێببینە، هاوڕێی سێیەم، دڵو گیرفانیت لەسەر دادەخات، هەرگیز لەگەڵیدا مەڕۆ بۆ هیچ شوێنێك!

## ژیان فێری کردم

کاتێك نینۆکمان زیاد دەکات، دەیقرتێنین، بەڵام پەنجەکانمان نابڕینو برینداریان ناکەین، گرفتە خێزانییەکانیش بە هەمان شێوەن، کەواتە ئەگەر گرفتو ناکۆکی خێزانیمان زیادی کرد، پێویستە کۆتایی بە گرفتو ناکۆکییەکان بهێنین، نەك بە پەیوەندییەکانمان.



# ژیان فێری کردم

مەرج نییە هەر کەسێک قەڵەمی گرتە دەست، نووسەر بێت، هەر کەس پەڕاوی ڕەش کردەوە، دانەر بێت، هەرکەس شتە نادیارو شاراوەکان لێک بداتەوە، فەیلەسوف بێت، هەر کەسیش چیرۆکو بەسەرهاتمان بۆ بگێڕێتەوە زانا بێت، مەرج نییە هەر کەس لەبەر خۆیەوە لێوی جوڵاند، یادی خودا بکات، هەر کەسیش ژیانو گوزەرانی ئاڵۆز بوو، دنیا نەویست بێت، هەموو ئەسپ سوارێکیش سوارچاک نییە، هەموو عەمامە بەسەرێکیش شێخ نییە، هەر کەس سمێڵی بادا گەنج نییە، هەرکەس سەری لەقاند خۆبەکەمزان نییە، هەرکەس پێ بکەنێت ماناى وانییە دڵخۆشە!



سزای کەسی ژیرو تێگەیشتوو، ئەوەیە کە لەگەڵ کەسێک بەندی بکەیت، کە لێی تێناگات، سزای کەسی ئەزموونداریش ئەوەیە کە سەرۆکایەتی کەسانی بێ ئەزموون بکات، سزای کەسی زاناش ئەوەیە کە زانستەکەی بخاتە بەردەم کەسانی نەزان، سزای ئافرەتیش ئەوەیە کە ڕێگری قسەکردنی لێ بکەیت.

## ژیان فێری کردم

فەرمانڕەوایی بە سێ شت دامەزراوو پتەو دەبێت: هاندانو سوپاسکردنی کەسە باشو دڵسۆزەکان، سزادانی کەسە خراپەکان، بێداریی و شەونخوونی لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا!!



ئەگەر کەسێک وەسفی کردی بە سیفەتێک کە لە تۆدا بوونی نەبوو، بەڵام تۆ پێی ڕازی بیت، ئەوا سەرزەنشتت دەکات بە شتێک کە لە تۆدا بوونی نییە..



## ژیان فێری کردم

سەرسامم بەو کەسانەی تاکە چەکی دەستیان، عەقڵو ژیرییانە، نەك زمانیان.. بەهێزترین وەڵامیان بێدەنگییە، نەك زۆر قسەکردن.

## ژیان فێری کردم

ستەم سێ جۆرە: ستەمی مرۆڤ لە دەروونی خۆی، ئەوەیە کە ئامۆژگاری خۆی ناکات، ستەمی مرۆڤ لە گەلەکەی، ئەوەیە کە خزمەتیان ناکات، گەورەترین ستەمیش ئەوەیە، کە مرۆڤ دان بە گەورەییو تاکو تەنهایی خودای گەورەدا نەنێت..




جوانی عەقڵ، لە بیرکردنەوەدایە، جوانی زمان لە بێدەنگیدایە، جوانی ڕووخسار لە زەردەخەنەدایە، جوانی بارودۆخو گوزەران لە بەردەوامیدایە، جوانی قسەوگوفتار، لە ڕاستگۆییدایە، جوانی دڵ دوورکەوتنەوەیە لە دووڕوویی!






ئەگــەر کۆکبین و پێکــەوە بین، هەرچەندە دوژمــن بەهێزبێت ناتوانێت بەســەرماندا ســەربکەوێت.. کۆمەڵێك مێروولــە بینیان وا وشترێك بەرەوڕوویان دێت، هەندێکیان وتیان: بڵاوبنەوە تا بەقاچەکانی نەتان شێلێت، مێرووڵەیەکی دانا لە نێویاندا هاتە دەنگو وتی: ئەگەر هەموومــان کۆببینەوەو یەکبگرین، دەتوانین بەســەریدا زاڵبین و لە ناوی بەرین..




ئەگــەر جیاوازی کەوتە نێوان دوو ســتەمکارەوە، ســەرەتا نهێنی کۆبوونەوەکانیان ئاشــکرا دەکەن، پاشــانیش لەیەک جیادەبنەوە، ئەوەش لە بەرژەوەندی ستەملێکراوەکانە.. بۆ نموونە:

ڕۆژێک گورگێــکو کەمتیارێک لە ڕێگەدا بە یەک دەگەن، هــەر یەک لــەوان ڕەخنە لەوی دیکەیــان دەگرێت، گورگ بە کەمتیــاری گوت: تۆ ناتوانــی ڕووبەڕووی ڕووناکــی ببیتەوە، کەمتیارەکەش پێی گوت: تۆش ناتوانی ڕووبەڕووی هێز ببیتەوە، گورگەکەش وتی: تۆ ترســنۆکی تەنها لە تاریکیدا دەتوانی نێچیرەکەت ڕاو بکەیت.. کەمتیارەکەش وتی: تۆ لاوازی، تەنها بەو مەڕە دەوێریت کە شــوانەکەی لێی بێئاگایەو لە ڕانەکەی دابڕاوە.




ئەوینی پاکو ڕاستەقینە، تەنها ئەوینی دایکە بۆ جگەرگۆشەکەی، جگە لەم ئەوینە هەموو ئەوینەکانی دیکە، تێکەڵاوە بە بەرژەوەندیو مەبەستو ئارەزووەکان..



# ژیان فێری کردم

ئافرەت چەند جۆرێکە: دەردە، دەرمانە، نەخۆشییە، چارەسەرە:

- ئافرەتی زیرەو خاوەن ئاکاری جوانو ڕەوشتبەرز:-

دەرمانە بۆ هاوسەرەکەی، دەبێتە هۆی ڕەوینەوەی خەمەکانی، لە هەموو گرفتە دەروونیو ماددییەکاندا هاوکارییەتی.

- ئافرەتی نەزانو نەفامو زماندار:-

دەردە بۆ هاوســــەرەکەی، بە میکرۆبی دوودڵیو کێشەو ناکۆکی هەموو ئەندامانی خێزانەکەی توش دەکات..

- ئافرەتی خۆبەلزانو لە خۆبایی:-

نەخۆشییە بۆ هاوسەرەکەی، چارەسەری تەنها جیابوونەوە، یان هەوێدارییە، هەر دوو ئەم کارەش سەختو دژوارە.

- ئــافــرەتــی چــاکو دامــــەزراوو زیرەو داناو ئاکارجوان:-

چارەسەرە، شیفایە، ســــەرچاوەی ئارامیو بەختەوەرییە، نەك تەنها بۆ هاوسەرەکەی، بەڵکو بۆ هەموو ئەو دەردو بەڵایانەی دووچاری کۆمەڵگەکەی دەبن.

# ژیان فێری کردم

زۆربەی خەڵکی ئەوەی کە دەیڵێن، جێبەجێی ناکەن، خەندە دەکەن بە ڕووی ئەو کەسانەدا کە سۆزیان پێنابەخشن، هاوڕێیەتی کەسانێک دەکەن کە متمانەیان پێناکەن، خزمەتی کەسانێک دەکەن کە ڕێزیان لێناگرن، مەرایی بۆ کەسانێک دەکەن کە خۆشیان ناوێن، شتگەلێک هەڵدەگرن کە بەکاریناهێنن، چروکی دەکەن لەوەی کە هەیانە، بەخشندەن لەو شتانەدا کە خاوەنی نین، حەز لە شتێک دەکەن کە زیانیان پێدەگەیەنێت، ڕقیان لەو شتانەیە کە سوودیان پێدەگەیەنێت، تەمەنیان لە شتێکدا بەسەردەبەن کە سوودی لێ نابینن.




کاتێک هاوکاری کەسێک دەکەیت، بۆئەوەی بەسەر چیایەکدا سەربکەوێت، لەگەڵیدا بمێنەرەوە تا لە لوتکە نزیک دەبێتەوە.



# ژیان فێری کردم

شاجوانەکانی جیهان، دوای چەند ڕۆژێك لە یاد دەکرێنو بیردەچنەوە، بەڵام زاناکانو داهێنەرەکانو ئەو دایکانەی گەورە پیاوانی مێژوویان بەرهەمهێنـــاوە، ناویان لە مێژوودا تۆمار دەکرێ، تا ئەو ســـاتەی مرۆڤ لەسەر زەوی بێت، مێژوو دەخوێنێتەوەو ناوی ئەوان لە بیرناچێتەوە.

# ژیان فێری کردم

هەموو مرۆڤێك دوو چاوی هەیە، بەڵام زۆربەی خەڵكی تەنها بە یەك چاو دەبینن، هەموو مرۆڤێك یەك زمانو دوو گوێی هەیە، بەڵام زۆربەی خەڵكی بە دوو زمان قسە دەكەنو بە یەك گوێچكە دەبیستن، خوای گەورە لە هەموو مرۆڤێكدا دوو دەستی دروستكردووە، بۆئەوەی دەستێك بەكاربهێنێت بۆ ڕاپەڕاندنی كارەكانی خۆی، دەستەكەی دیكەی بۆ هاوكاریو یارمەتی كەسانی دی، بەڵام زۆربەی خەڵكی تەنها یەك دەست بەكاردەهێنن، بۆ هەموو مرۆڤێك دووقاچی دروستكردووە، بۆئەوەی قاچێك بەكاربهێنێت بۆ هەوڵدانو تێكۆشانی دنیاو قاچەكەی دیكەی بۆ هەوڵدانی ڕۆژی دوایی، بەڵام زۆرێك لە خەڵكی تەنها یەك قاچ بەكاردەهێنن.

خوای گەورە بۆ هەموو مرۆڤێك یەك دڵی دروستكردووە، بۆئەوەی خەمەكانی ژیان بە كورتی هەڵگری، بەڵام ئەوەندە خەم بۆ خۆی دروستدەكات، كە چەندین دڵ بەرگەی هەڵگرتنی ناگرێت، بۆ هەموو مرۆڤێك یەك تەمەنی داناوە، بەڵام زۆرێك لە ئێمە ئەوەندە كاتەكانمان بە فێڕۆ دەدەین، وەك ئەوەی خاوەنی سەد تەمەن بین، بۆ هەموو مرۆڤێك تەنها یەك مردنی داناوە، بەڵام زۆرێك لە مرۆڤەكان بەهۆی ئەزانیو نەفامی خۆیانەوە، هەموو ڕۆژێك جارێك تامی مردن دەچێژن..



## ژیان فێری کردم

ئەگەر مرۆڤ هەموو ئەو شتانەی پێببەخشرایە کە هیواو ئاواتییەتی، ئەوا یەکتریمان لە ناودەبرد..

## ژیان فێری کردم

زۆربەی خەڵکی جیادەبنەوە لەو کەسانەی ئازاری جەستەیان دەدەن، بەڵام گوێنادەن بەو کەسانەی ئازاری دڵو ڕۆحیان دەدەن، ئەی مرۆڤ بیربکەرەوە تۆ بە ڕۆحو دڵو ویژدان مرۆڤی، نەك بە گۆشتو خوێنو ئێسقان!

## ژیان فێری کردم

زۆربەی ئەو کێشەو ناکۆکیانەی لە نێوان مرۆڤەکاندایە، هۆکارەکەی شەهوەتو ئارەزوو، تەماعو چاوچنۆکییە.

## ژیان فێری کردم

ئارامگرتن لەسەر هەواو ئارەزوو، قورسترە لە ئارامگرتن لەسەر جەنگ، پاداشتیشی زیاترە..




ئەگەر بە چاوێکی گەشبینانەوە بۆ ژیان بڕوانیت، ئەوا هەموو شتێك بە جوانی دەبینیت.

# ژیان فێری کردم ٧

لە چوار شوێندا پارێزگاری لە شکۆو ڕێزی خۆت بکە: لە خوێندندا لەگەڵ کەسـێک کە لە تۆ شارەزاترە، لە فێربووندا لەگەڵ کەسێک کە لە تۆ گەورەترە، لە نەیاریت لەگەڵ کەسێک کە لە تۆ بەهێزترە، لە موناقەشەکردندا لەگەڵ کەسێک کە ئاستو پلەی لە تۆ کەمترە.






هەرگیز هاوسەرگیری لەگەڵ کەسی نەزاندا مەکە، چونکە کەسی نەزان دەردو بەڵاو نارەحەتییە بۆ ژیان، هەروەها هاوسەرگیریش لەگەڵ کەسی زۆر ڕۆشنبیردا مەکە، چونکە کەسی زۆر ڕۆشنبیریش واتە ئەو کەسەی کە پلەو پایەو خوێندەواری زۆر لەسەرو تۆوییە، نەگبەتی‌و دەردەسەرییە!

## ژیان فێری کردم

مرۆڤی ژیر ماڵو سامانی خەرج دەکات لە پێناو تەندروستی‌و لەشساغیدا، مرۆڤی نەزان تەندروستی خەرج دەکات لە پێناوی بەدەستهێنانی ماڵو ساماندا!




جوانی ناخ‌و دەروون خاوەنەکەی‌و دەوروبەری بەختەوەرو دڵخۆش دەکات، بەڵام ئەگەر جوانی تەنها لە ڕووخساردا بوو، ئەوا خاوەنەکەی‌و دەوروبەریشی دووچاری دەردەسەری دەکات!






کۆشکو خانووی پتەو، زیاتر لە جوانکاریو ڕازاندنەوە پێویستی بە چیمەنتۆو شیشو ئاسن هەیە، هەروەها نەتەوەی پێشکەوتووش زیاتر لەوەی پێویستی بە هەڵپەرکێو سەماو گۆرانی بێت، پێویستی بە کەسانی عەبقەریو زاناو پسپۆر هەیە، لە بواری زانستو پیشەسازیدا.




لەوانەیە گەشتێکی کورت لەگەڵ خێزانو منداڵەکانتدا، زۆرێک لە کێشەکانتان چارسەر بکات.




سێ کەس هەواڵو زانیاریو نهێنییەکانی تۆ دەزانن، کە کەسانی تر نایزانن، ئەو سەرتاشەی دێتە ماڵەوەو سەرت بۆ چاک دەکات، ئەو خزمەتکارەی خزمەتی میوانەکانت دەکات، لەگەڵ شۆفێرە تایبەتییەکەت!





هەر كەسێك بەخشندەو چاكەكاربێت، خەڵكی خۆشیان دەوێت، هەركەسێك ڕووخۆشو مامەڵەی جوان بێت، دراوسێكانی خۆشیان دەوێت، هەركەسێك چاكەی كەسانی دی لە یاد نەكاتو خراپەكانیان بسڕێتەوەو لە یادیان بكات، خوشكو براكانی خۆشیان دەوێت، هەركەسێك بەردەوام هەوڵبدات بۆ تێگەیاندنی بەرامبەرەكەیو نەرمونیان بێت، قوتابییەكانی خۆشیان دەوێت..

هەركەسێكیش كردارو ئاكاری بەرزو جوان بێت، سوود بە خەڵكی بگەیەنێتو لە ئازاردانو بێزاركردنی خەڵكی دووركەوێتەوە، ئەوە خودای گەورە پاشان هەموو خەڵكی خۆشیان دەوێت.



وامەزانە گەشبینەكان خەمیان نییە، ئەوان ئازاو چاو نەترسن، بەسەر خەمەكانیاندا سەردەكەون.



# ژیان فێری کردم

ڕۆژی وا هەیە بە ساڵێك بەسەر مرۆڤدا گوزەر دەكات، ڕۆژی وەهاش هەیە بە ئەندازەی كاتژمێرێك بەسەرتدا گوزەر دەكات.. هەردووكیان هەر ڕۆژێكەو لە ٢٤ كاتژمێر پێكهاتوون.. بەڵام هەستەكانمان تیایاندا جیاوازە.

## ژیان فێری کردم

لە ئازارەکانی ژیان ئەوەیە کە هاوڕێکانت زۆر سەرقاڵنو تۆش پێویستت بە کەسێك هەیە وردە توانات بەرز بکاتەوە..



ناتوانم کەسایەتییەکی کاتی بۆخۆم دروست بکەم، لە پێناوی سەرنجڕاکێشانو سەرسامبوونی کەسانی دەوروبەر، ئەوە منم.. کردەوەو هەڵسوکەوتم، شێوەو ئاکارم، بەو جۆرەیە کە دەمبینیتو دەمناسیت، هەرگیز لە پێناوی هیچ کەسدا ناگۆڕێم..



ئەگەر دەتەوێت ژیانت بەختەوەرو ئاسودە بێتو ڕۆژگارەکانی ژیان بە ئاسانی بەسەرتدا گوزەربکەن، هەوڵ بدە لە هەموو کاروبارەکان چێژ وەربگریت، تەنانەت ئەگەر قورسو سەختیش بێت..





هەر کیسەیەك چارەســەرێکی هەیە، ئاسن بە کەمێك ئاگر نەرم دەبێت، بەڵام ئەگەر دەریایەك ئاوی بەسەردا بڕێژیت، نەرم نابێت!

## ژیان فێری کردم

ئەو هەورە بروسکەیەی ئاوی لەگەڵدا نەبێت، گژوگیا سەوز ناکات، ئەو کارەش کە نییەتی پاکو دڵســۆزی تێدا نەبێت، هیچ بەرهەمێکی چاکی نابێت.

## ژیان فێری کردم

قەناعەتو چاوچنۆکی بریتین لە دەوڵەمەندیو هەژاری، دەگونجێ هەژارێك لە تۆ دەوڵەمەندتــر بێت، چونکە خاوەنی قەناعەتە، لەوانەیە دەوڵەمەندێك لە تۆ هەژارتر بێت.. چونکە بەخیلو چاوچنۆکە.




مرۆڤ نازانێت ژیان چەندە کورتە، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دەگاتە نزیکی چرکە ساتی کۆتایی هاتنی ژیانی..

## ژیان فێری کردم

مرۆڤ بۆئەوەی هەمیشە دڵخۆشو شادمان بێت، دەبێت پارێزگاری لە تەندروستی بکات، بۆئەوەی هەمیشە بەختەوەربێت، دەبێت پارێزگاری لە ئاکارو ڕەوشتی جوانی بکات، بۆئەوەی ناووناوبانگی هەمیشە زیندوو بمێنێتەوە، دەبێت پارێزگاری لە عەقڵی بکات، ئەگەر حەزت لە هەموو ئەوانەشە، واتە «شادمانیو بەختەوەریو مانەوەی ناوبانگت بە زیندویی بۆ هەمیشە» پارێزگاری لە دینت بکە!




جوانترین ساتەکانی ژیان ئەوەیە کە تۆ لە دڵی خەڵکیدا بژی، بەبێئەوەی ناپاکیو فێڵیان لێ بکەیت..






هەندێك لە خەڵكی هەوڵدەدەن، كاروانی پێشـــكەوتن بە وشـــەی «نەخێر» بووەستێنن، هەروەكو چۆن منداڵان هەوڵدەدەن، بە دانانی بەرد لەسەر سكەی ئاسنینی شەمەنەفەر كێشە بۆ ڕۆیشتنی شەمەنەفەرەكە دروست بكەن..




نووســـتن لەسەر حەسیرێکی سادە، کە شـــوێنەواری بە جەستەتەوە دەرچێت، لە کاتێکدا تەندروســـتو لەشساغیت، باشـــترە لە نووستن لەسەر سیسەمی ناڵتون، لە کاتێکدا تۆ دەردەدارو نەخۆشیت!




هەرگیز لە بەخشیندا چاوەڕوانی پاداشت نەکەم، هەمیشە لەگەڵ خۆمدا ڕاستگۆ بم، پاشان لەگەڵ خەڵکیدا ڕاستگۆ بم..




هەرگیز ستەم لەو کەسانە مەکە کە لاوازو بێدەسەڵاتن، چونکە بێگومان، ڕۆژێک دادێت کەســانێک کە لە تۆ بەهێزترن ســتەمت لێ بکەنەوە.

## ژیان فێری کردم

ئایین غەریزەکان ناسڕێتەوە، بەڵکو ڕایان دەهێنێـــو پەروەردەیان دەکات، پەروەردە سروشتی مرۆڤەکان ناگۆڕێت، بەڵکو فێریان دەکات..

## ژیان فێری کردم

ڕاســـتگۆیی ڕێگەیەکـــە خاوەنەکـــەی لەناوناباـــات، ئەگەر بۆ ماوەیەکـــی کەمیـــش بیخاتو ئازاری بدات، ســـەرەنجام هـــەر دەبێتە هۆی ڕزگاربـــوونو بەختەوەربوونی مرۆڤ، بەڵام درۆکردن، ڕێگەیەکە خاوەنەکەی ســـەرناکەوێو ڕزگاری نابێت، ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی زۆریش لە بەرهەمی درۆکەی بخوات..

## ژیان فێری کردم

هەرگیز بەو شـــێوەیە مامەڵە ناکەم کە خوشکو براو هاوڕێکانم مامەڵەم لەگەڵدا دەکەن، بەڵکو هەمیشـــە هەوڵبدەم باشـــتر لەوان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەم..

## ژیان فێری کردم

سەرەتا لە خۆم تێبگەم، پێش ئەوەی داوا لە کەس بکەم، کە لێم تێ بگات.. لە شکستدا کۆنترۆڵی خۆم بکەمو بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی لێ بکەم، بۆئەوەی بمگەیەنێت بە سەرکەوتن..

## ژیان فێری کردم

هیوا بکەمە چرایەك، تا بۆ هەموو شوێنێك هاوڕێم بێت، هەروەها لە کاتی خەمو پەژارەدا کۆنترۆڵی خۆم بکەمو ڕووخساری گەشو زەردەخەنەی سەر لێوانم ون نەکەم، بۆ ئەوەی دۆستانم خەمبار نەکەم.. دوژمنانیشم دڵخۆش نەکەم.

## ژیان فێری کردم

کاتێك مرۆڤ بیرو هۆشی ناخاتە کار، دەبێتە ئامرازێك بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووەکانی کەسانی دی.






بۆ بەدەستهێنانی پلەو پایە هیچ پەلە مەکە، چونکە ئەگەر تۆ شیاوی ئەو پۆستە بیت دڵنیابە زەمانە پێت دەبەخشێت، ئەمڕۆنا سبەی، خۆئەگەر شیاو نەبیت بەو پۆستو پلەو پایە، ئەوا نیگەران مەبە کە پێت نەبەخشراوە، بۆ ئەوەیە کە کەموکوڕییەکانت دەرنەکەوێت.



لەبەرامبــەر مافی براکانتدا کەمتەرخەمی مەنوێنە بە مەبەســتی خۆشەویستیت بۆیان، چونکە ژیان بەخشــینو وەرگرتنە، لە بەرامبەر مافی پەروەردگارتدا کەمتەرخەمی مەنوێنە، بەو هیوایەی خودا ڕەحمی زۆرە، چونکە چاوەڕوانی چاکە لەگەڵ خراپەدا نەریتی کەسانی کەم عەقڵە، چاوەڕوانی ئەوە مەکە لە خوشــکو براکانت کە لە پاداشــتی چاکە چاکەت لەگەڵدا بکەن، چونکە کەمتەرخەمی لە سروشتی مرۆڤە، بەڵام لە پەروەردگارت چاوەڕوانی بکە، کە پاداشــتی چاکەت زیاتــر لە چاکەکــەت بداتەوە، چونکە لە تــەرازووی خوای گەورەدا پاداشتی چاکە تەنها چاکەیە..



پارێزگاری لە ئەدەبو ئارامیم بکەم لە پێنج شــوێندا، لە جێگەی خواپەرســتی، کۆڕی زانیــاری، چاوپێکەوتن لەگــەڵ گەورەکاندا، قســەکردن لەگەڵ زاناو خاوەن پلەوپایەدا، لە مامەڵەکردنم لەگەڵ ئامۆو ڕێبواراندا..





لە چوار شوێندا خەمبارو نیگەران مەبە، لە سەفەر لەگەڵ هاوڕێکەتدا، لە بێداری لەگەڵ براکەتدا، لە یاریو گاڵتەو گەپ لەگەڵ خێزانو منداڵەکانتدا، لە ساتەکانی دڵخۆشی لەگەڵ ئەو کەسانەی متمانەت پێیانەو هاودەمو هاوکارتن.

## ژیان فێری کردم

ئەزموون بەهەردو زیرەکیت پێدەبەخشێت، کەمو کورتییو خراپەکانت دەسڕێتەوە، بیناییو دووربینیت زیاد دەکات، پشوو درێژیو ئارامیت پێدەبەخشێت، مرۆڤی ژیر دەکاتە حەکیمو دانا، مرۆڤی حەکیم دەکاتە فەیلەسوف، ترسنۆك دەکاتە کەسێکی ئازاو بوێر، چروك دەکاتە بەخشندە، دڵە بێهێزو لاوازەکان بەهێز دەکات، دڵڕەقەکان نەرمونیان دەکات، بەڵام هەر کەسێك سوودی لە ئەزموونەکانی وەرنەگرت، ئەوە ئەزموونەکەی دەبێتە هۆی گومڕابوونی، خراپە لەسەر خراپە دەکات، ئەوە کەسێکی نەزانو بێسوودە.

## ژیان فێری کردم

زانست بریتی نییە لەوەی نەزانراوەکان بزانیت، بەڵکو بریتییە لەوەی سوود لەو زانیارییانە وەربگریت کە دەیزانیت.



لە کاتو ساتی نەخۆشیدا نیعمەتی لەشساغی دەزانین، بەڵام لە تەندروستیدا ئازارو نارەحەتییەکانی نەخۆشی لە یاد دەکەین.



لە نارەحەتیو گرفتەکانی ژیاندا، سروشتە ناپاکەکان ئاشکرا دەبن، لە کاتی فیتنەو ئاشوبدا بۆچوونە ڕەسەنەکان ئاشکرا دەبن، لە دادوەریو ناوبژیوانیدا ڕەوشتە جوانەکان ئاشکرا دەبن، لە کاتی بوونی ماڵو ساماندا بانگەشەی وەرەعو خۆنەویستی ئاشکرا دەبێت، لە شانو شەوکەتدا بەخشندەیی ڕەسەن دەردەکەوێت، لە نارەحەتیو تەنگژەدا برایەتی ڕاستەقینە ئاشکرا دەبێت.





کاتێک ویســـتم بگریم، لە جێگەیەک دەگەڕێم کە هیچ کەس نەمبینێت، تا ئەوەندەی دەمەوێت ئەسرینی چاوەکانم هەڵوەرێنمەو پەند لەو بابەتە وەربگرم کە بووەتە هۆی هەڵوەرانی فرمێسکی چاوەکانم، پاشان فرمێسکەکانم بسڕمەو بە خەندەوە بگەڕێمەوە..



وشەی پاکو چاکو ڕاست، تیرێکە هەموو دڵەکان دەبڕێت.



پەیوەندییەکانمان لەگەڵ خەڵکیدا وەکو گەڵای درەختەکانن، ئەوەی دەمێنێتەوە بەردەگرێت، ئەوەشی هەڵدەوەرێت ناگەڕێتەوە.

## ژیان فێری کردم

دروستکردنی متمانە وەکو کۆشکێک وایە لە لم، دروستکردنی زۆر سەختە، بەڵام تێکدانو ڕووخانی زۆر ئاسانە.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر خۆشەویستی لە دەرگای دای، بەخێرایی دەرگاکەت مەکەرەوە، چونکە کەسانێک هەن وەکو منداڵ وان، لە دەرگا دەدەنو پاشان ڕادەکەن.



## ژیان فێری کردم

ئەگەر نەمتوانی ببمە پێنوسێك بۆ نووسینەوەی بەختەوەری کەسێك، هەوڵ بدەم لانی کەم لاستیکێك بم، بۆ سڕینەوەو لابردنی خەمی کەسێکی دیکە.

## ژیان فێری کردم

مرۆڤەکان سێ جۆرن، کەسانێك وەکو هەوا وان، هەرگیز ناتوانین بێ نیاز بین لێیان، واتە ژیان بەبێ ئەوان ئاستەمە، کەسانێکیش وەکو دەرمان وان، هەندێك کات پێویستمان پێیانە، کەسانێکی دیکە هەن، وەکو دەردو نەخۆشی وان، هەرگیز بە بوونیان هەست بەخۆشحاڵی ناکەین.

## ژیان فێری کردم

ژیان وەکو پیانۆ وایە، دوگمە ڕەشەکانی ساتە دژوارو خەمو پەژارەکانی ژیانمانە، دوگمە سپییەکانی ساتەکانی بەختەوەریو ئاسودەییمانن، هەردووکیان پێکەوە ڕۆڵ دەبینن بۆئەوەی پارچە مۆسیقایەکی خۆشمان پێشکەش بکەن، تەنها بە دوگمە سپییەکان ئاوازەکان ناچڕێن، بێگومان دەبێت بۆ چڕینی ئاوازێکی خۆش دوگمە ڕەشەکانیش بەکاربهێنین. ئەگەر ناخۆشییەکانی ژیان نەبووایە، تاموچێژمان لە خۆشییەکان نەدەبینی!




ئەگەر خاڵێکی ڕەش لە ناوەڕاستی لاپەڕەیەکی سپیدا دابنێی، پاشان لە خەڵکی بپرسی چی دەبینن لەم لاپەڕەیەدا، هەموو دەڵێن: خاڵێکی ڕەش! ئەی کەواتە ئەو هەموو بەشە سپییەی لاپەڕەکە چی لێهاتو بۆ کوێ ڕۆیشت؟ زۆرینەی خەڵکی بەو شێوەیە تەنها هەڵەکانمان دەبینن!



ئاو هەر ئاوە چ لە ناو پەرداخی فەخفوریدا بێت، یان لە ناو پەرداخی شوشە، یاخود لە نێو پەرداخی ئاڵتون، هەرگیز بە گۆڕینی ڕووکەشەکەی شێوەکەی خۆی ون ناکات، تۆش وەك ئاوبە، با ڕووکەش ناواخنمان نەگۆڕێت..

ژیان فێری کردم

مرۆڤ ڕەنگو ڕووخساری، شوێنی لە دایکبوونی، بنەماڵەو ڕەچەڵەکی، ڕەگەزو باووباپیرانی لە دەست خۆیدا نییەو خۆی ناتوانێت ئەمانە هەڵبژێرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە مرۆڤەکان سورن لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵماندا بەپێی ئەم شتانە!

ژیان فێری کردم

ئاسانە دەستت لەسەر دەمت دابنێی بۆئەوەی قسە نەکەیت، بەڵام ئەستەمە دەستت لەسەر دڵت دابنێی بۆئەوەی ئازاری نەگات!



ژیردەکان سێ جۆرن: ئەو کەسەی واز لە دنیا دەهێنێت، پێش ئەوەی دونیا بەجێبهێڵێت. ئەو کەسەی گۆڕەکەی بە چاکەو کرداری جوان ئاوەدان دەکاتەوە، پێش ئەوەی بچێتە ناوی. ئەو کەسەی خودا لە خۆی ڕازی دەکات، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای!



نیوەی متمانە بەخۆبوون، بەراورد نەکردنی خۆتە بە کەسانی دی، نیوەی پشوودانو ئارامی، خۆهەڵنەقورتاندنە نێو ژیانی کەسانی دەوروبەرە، نیوەی حیکمەتو دانایی بێدەنگییە، سەرەکیترین بنەمای بەختەوەری باوەڕبوونە بە قەزاوقەدەر، هەمیشە بڵێ: پەروەردگارا ئەو شتەم پێببەخشە کە دەبێتە مایەی بەختەوەریم!



خۆگێلکردن لە هەندێک هەڵوێستدا.. زیرەکییە.





جوانترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە ناگۆڕێت، ئیدی ژیانو گوزەرانی هەرچۆنێک بێت!

## ژیان فێری کردم

جوانترین خەندە، ئەو خەندەیەیە کە بە خەمو پەژارە دەڵێت: ناتوانی بەسەرمدا سەربکەویت، جوانترین هەوڵدان ئەو هەوڵو کۆششەیە کە بە شکست دەڵێت: ناتوانیت شکستم پێ بهێنی، جوانترین هیوایش ئەو هیوایەیە کە بە بێهیوایی دەڵێت: ناتوانی بەسەرمدا زاڵ بیت!

## ژیان فێری کردم

ژیان مامۆستایە بەبێ تەختەڕەش، پێنووسێکە کردارو ڕەفتارو کردەوەکانمان دەنووسێتو تۆماری دەکات






هەرگیز حەسودی بە کەسێك مەبە کە خودا نیعمەتێکی پێبەخشیوە، چونکە تۆ نازانی خودا چ نیعمەتێکی لێوەرگرتۆتەوە، هەرگیز خەمبار مەبە ئەگەر خودا نیعمەتێکی لێوەرگرتیتەوە، چونکە تۆ نازانی لە بری ئەو نیعمەتە، خودا چ نیعمەتێکی ترت پێدەبەخشێت! کەواتە لە هەموو بارودۆخێکدا سوپاسی خودا بکە!



لــە ژیاندا پارێزگاری لە دوو حیکمەت بکــەو هەرگیز لە یادیان مەکە:

یەکەم: هەرگیز هەوڵ مەدە بگەیت بە کەســێك، کە ئەو هەوڵ نادات بگات بە تۆ!

دووەم: جەنــگ لەگەڵ جیهاندا مەکە، لــە پێناوی مرۆڤێك، کە تەنانــەت ناتوانێت جەنگ لەگەڵ خۆبەگەورە زانینەکەیدا بکات لە پێناوی تۆ!

## ژیان فێری کردم

ژیری مرۆڤ وەکو پەڕەشوت وایە، تا نەکرێتەوە کارناکات.

## ژیان فێری کردم

قسەکردن لەگەڵ خەڵکیدا وەکو دروومان وایە، تۆ بەکرەکەیتو قسەکانت دەرزییە، ئەگەر بە چاکی دروومان بکەیت، جلوبەرگێکی نەخشینو ڕازاوەو قەشەنگ دروست دەکەیت، بەڵام ئەگەر هەڵەت کردو بە باشی دروومانت نەکرد، ئەوا تەنها خۆت بریندار دەکەیت.

## ژیان فێری کردم

هەموو خەمێك دەڕواو كۆتایی دێت، تەنها یەك خەم نەبێت، ئەویش لێپرسینەوەی ڕۆژی دواییە، هەموو ئازارێك كۆتایی دێت، تەنها یەك ئازار نەبێت، ئەویش ئازاری ویژدانە..

## ژیان فێری کردم

عەقڵو ژیری مرۆڤ بە درێژی تەمەن ناپێورێت، چەندین منداڵی بچووك هەیە، خاوەنی عەقڵێكی داهێنەرو گەورەن، چەندین گەورەو بە تەمەنیش هەیە، خاوەنی عەقڵێكی بەتاڵن!




حەوانەوەو پشووی جەستە لە كەمی خۆراكدایە، ئارامی دەروون لە كەم خەوتندایە، پشووی دڵ لە كەمی خەمو خەفەتدایە، حەوانەوەو ئارامیو پشووی زمانیش لە كەم قسەكردندایە.






باوەڕبوون بە قەزاوقەدەر، مانای ئەوە نییە تۆ بخەویتو چاوەڕوانی ڕزقو ڕۆزی بکەیت، بەڵکو مانای وایە هەڵسەو کاربکە، بەدوای ئەو ڕزقو ڕۆزییەدا بگەڕێ کە لە قەدەرتدا تۆمارکراوە.

١٩٨

## ژیان فێری کردم

کەسایەتیو بەهێزی مرۆڤ لە توانای باسکو بازوو، هێزو دەسەڵاتیدا خۆی حەشار نەداوە، بەڵکو لە هەڵسوکەوتو جوانی ئاکارو ڕەوشتیدا خۆی حەشارداوە..

## ژیان فێری کردم

هەرگیز بڕیار مەدە بەسەر ئایندەو چارەنووستدا، سەرنج بدە، پێغەمبەران «سەلامی خودایان لێبێت» شوانی مەڕومالآت بوون، سەرەنجام بوونە سەرکردەو پێشەوای گەلەکانیان.

## ژیان فێری کردم

بۆئەوەی کەسێکی سەرکەوتوو بیت، دەبێت حەزو ئارەزووت لە سەرکەوتن، گەورەتر بێت لە ترسان لە شکست..

## ژیان فێری کردم

ڕێزی خەڵکی بگرە، ڕێزت دەگرن، ببەخشە خودا پێت دەبەخشێت، هەمیشە لێو بەخەندە بە، خودا پاداشتت دەداتەوە، خۆت بە کەم بزانە، پلەو پایەت بەرز دەبێتەوە، چونکە ئەوە هاوکێشەو ڕێسای ژیانە.



## ژیان فێری کردم

عەقڵی مرۆڤ سێ جۆرە: عەقڵە گەورەکان لەبارەی پێشکەوتن و بیرۆکە نوێیەکانەوە دەدوێن، عەقڵە مامناوەندییەکان لەبارەی ڕووداوەکانەوە دەدوێن، عەقڵە بچووکەکانیش لەبارەی خەڵکییەوە دەدوێن.

## ژیان فێری کردم

ئەگەر گەڕایتەوە بۆ ماڵ و منداڵەکەت بەرەو ڕووت نەهات، تا بەوپەڕی شەوقەوە پێشوازیت لێبکات، تۆش بە خۆشحاڵییەوە لە ئامێزی بگریت، ئەوا بە کردارو هەڵسوکەوتتدا چاوبخشێنەرەوە، چونکە لە پەروەردەکردن و سەرپەرشتیکردنیدا، کێشەو گرفتێك هەیە.

## ژیان فێری کردم

پەیوەندی ڕاستەقینەی نێوان ژن و مێرد، وەکو پەیوەندی نێوان دەست و چاو وایە، ئەگەر دەست بریندار بوو، چاو فرمێسکی بۆ هەڵدەوەرێنێت.

## ژیان فێری کردم

مەگری بۆئەوەی لە دەستت چووە، بەڵکو چاوەڕێی ئەوە بکە کە لە داهاتوودا بەدەستی دێنیت.




هەموو مرۆڤەکان لە ساتەوەختی لە دایکبووندا یەکسانن، بەڵام لە کاتی ماڵاوایی هەمیشەیی لە ژیان جیاوازن، ئەوەش واتە سەرەتا گرنگ نییە، بەڵکو کۆتایی گرنگە!



هەندێك مرۆڤ وەكو مانگ وان، لە دوورەوە ڕووناكن‌و دەدرەوشێنەوە، بەڵام كاتێك لێیان نزیك دەبیتەوە ئەو كات دەزانیت كە چەندە تاریكن!

## ژیان فێری كردم

بۆئەوەی هیواو ئاواتەكانت بەدیبهێنیت، پێویستە ئازارو ناڕەحەتی وەكو بەشێك لە داواكارییەكانی ژیان، قبوڵ بكەیت.

## ژیان فێری كردم

بەختەوەری لە ئاسمانەوە بەسەرماندا دانابارێت، بەڵكو دەبێت لە زەویدا بیچێنین، بۆئەوەی بتوانین بیدوورینەوە.

## ژیان فێری كردم

سەروەت‌و سامان‌و دارایی زۆر، وەكو هەژارییەكی ڕیسواكەر وایە، هەردووكیان ویژدانی خاوەنەكانیان وێران دەكەن!



# ژیان فێری کردم

قسەو دەربڕینەکانمان بەرگو پۆشاکی بیروبۆچوونەکانمانن، پێویستە بیروبۆچوونمان بە بەرگی شڕو کۆنو دڕاو، ڕووپۆش نەکەین.

# ژیان فێری کردم

توڕەیی کەسی نەزان لە قسەکانیدایە، بەڵام توڕەیی مرۆڤی ژیر لە کردەوەکانیدایە.

# ژیان فێری کردم

هەموو شتێك لە ژیاندا ئەگەر زۆربوو بێ نرخ دەبێت، تەنها ئاکارو ڕەوشتی جوان نەبێت، هەتا زۆر بێت بەنرختر دەبێت.

# ژیان فێری کردم

هەرگیز لە کردنی چاکەو ڕەوشتی جوان پەشیمان مەبەرەوە، هەرچەندە خەڵکی خراپەت لەگەڵدا بکەن، تۆ چاکەیان لەگەڵدا بکە، زۆر باشترە لەوەی وەڵامی هەڵەکانیان بە هەڵە بدەیتەوە.






ئێمە ناتوانین ئاڕاستەی با بگۆڕین، بەڵام دەتوانین بەپێی ئاڕاستەی با، چارۆکەی کەشتییەکە ڕێک بکەینەوە..

## ژیان فێری کردم

هەژارترین کەس، ئەو کەسەیە کە بەبێ هیواو ئاوات ژیان دەگوزەرێنێت.

## ژیان فێری کردم

هەرگیز چاوەڕوانی ئەو شتە مەکە کە لە دەستی خەڵکیدایە، چونکە خەڵکی خۆشیان لە دەستی خوای گەورەدان.




بەختەوەری و ئاسوودەیی بە نەبوونی گرفت و کێشەکان بە دەستنایەت،

بەڵکو لە ڕێگەی زاڵبون و چارەسەری کێشەو گرفتەکاندا بەدەستدێت.



ئەگەر ئازار نەبووایە، مرۆڤ هەرگیز تامو چێژی لە خۆشی نەدەکرد.



وشەو دەستەواژە ڕاستەکان هەموو کات جوان نین، وشەو دەستەواژە جوانەکانیش هەموو کات ڕاست نین.



ڕێگە مەدە زمانت بەشداری چاوەکانت بکات لە کاتی ڕەخنەگرتنو بینینی کەموکورییەکانی خەڵکیدا، لە بیرت نەچێت، ئەوانیش وەکو تۆ خاوەنی زمانو چاون.

ژیان فێری کردم

شەوەکانی خەمباری هەرچەندە درێژبن، بێگومان ڕووناکی بەختەوەری هەرهەڵدێت، کورد وتەنی «بەری تەنگانە کورتە»!





کاتێک مرۆڤ بەرامبەر گیانداران بەبەزەییە، بەڵام بەرامبەر خودی مرۆڤ توندوتیژە، سەبارەت بە دروشمەکەی کەسێکی دووڕووە.

## ژیان فێری کردم

هەر کەس بەڕاستی خودای گەورەی ناسی، ئەوا هەموو شتێک لەم ژیانەدا بە جوانی دەبینێت!

## ژیان فێری کردم

مرۆڤەکان دەریایەکیان دەوێت، ئاوەکەی سازگار بێت، بۆئەوەی لێی بخۆنەوە، پاشان بە خەمەکانیان سوێری بکەن.






پیاو هەمیشە خەون دەبینێت بە ئافرەتێكی كامڵو تەواو لە هەموو ڕوویەكەوە، ئافرەتیش بە هەمان شێوە خەون دەبینێت بە پیاوێكی كامڵو تەواو لە هەموو ڕوویەكەوە، هەردووكیان لە بیریان كردووە، كە خودای گەورە دروستیكردوون، بۆئەوەی پێكەوە یەكتری تەواو بكەن..




دوو شـــت لە مرۆڤدا هەرگیز بەردەوام نابـــن، گەنجی‌و هێزو توانا.. دوو شـــت لە مرۆڤدا دەگۆڕێت: سروشتو شـێوە، دوو شتیش بە هەموو مرۆڤێك ســـوود دەگەیەنێت، ڕەوشـــتجوانی‌و لێبوردەیی، دوو شتیش بە هەموو كەس زیان دەگەیەنێت، حەسودی بردن بە خاوەن نیعمەتەكان، ڕقو كینە بەرامبەر بەخشـــندەكان.. دوو شتی دیكەش زیادو كەمیان زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت: خواردنو خواردنەوە، دووشتیش زیادبوونیان چاكەو كەم بوونیان خراپە، خواپەرستی‌و چاكەكردن.




هەندێجـــار پێویســـتە دوور بكەوینەوە، بۆئـــەوەی بزانین كێن ئەو كەسانەی بە شوێنماندا دەگەڕێن!




گومانی خراپ ئەو دەردە كوشـــندەیە، كە هەموو شتە جوانەكان لەناودەبات.




لەگەڵ هەموو بارودۆخێکدا بژی، کاتێک هاوڕێکەت دوادەکەوێت، هاوار مەکە بەسەریدا، کاتێک شتێک لە دەستدەدەیت شینی بۆ مەکە، بیربکەرەوە هەموو شتێک لە چارەنوستدا نوسراوە..




ناڕەحەتـــی‌و ماندوویونی پەرستش‌و گوێڕایەڵی لــە ژیاندا دەڕواو نامێنێت، بەڵام پاداشـــتەکەی دەمێنێتەوە، چێژو تامی تاوانیش دەڕوات، بەڵام سزاکەی دەمێنێتەوە.. کامیان بۆ خۆت هەڵدەبژێریت؟




هەرگیز سەرپێچی فەرمانو بۆچوونی دوو کەس مەکە؛ پزیشکێکی شارەزا کاتێک چارەسەر بۆ نەخۆشییەکەت دیاری دەکات، حەکیمێکی بە ئەزموون، کاتێک ئامۆژگاریت دەکات!






سەرەتا ڕەوشــــتبەرزی پاشان زانستو زانیاری، دواتر زیرەکی، ئەوە ئەو ڕیزبەندییەیە کە نەتەوەکەت سوودی لێدەبینێت!




ئەگەر توانیت بەسەر هەواو ئارەزووتدا سەربکەویت، دەتوانیت بەسەر هەموو جیهاندا سەربکەویت!




میللەت بە بوونی ســـێ کەس بەختەوەرو ئاســـودەو دڵخۆش دەبێت: فەرمانـــڕەوای دادپەروەر، زانای ئامۆژگاریـــکار، کرێکارو فەرمانبەری دڵسۆز.




هیچ شتێك بە ئەندازەی داوێنپاکیو ڕەوشتی جوان، پلەوپایەی مرۆڤ بەرزناکاتەوە.






هیچ کات ئەم دوو پەندە لە یاد مەکە:

یەکەم: کاتێک لە لوتکەی تووڕەییدا بوویت، بڕیار مەدە.

دووەم: کاتێک لە لوتکەی خۆشحاڵی و شادومانیدا بوویت، بەڵێن مەدە!

## ژیان فێری کردم

جوانترین ئاوازو دەربڕین لە ژیاندا، ئاوازو دەربڕینی، وشەی سوپاسگوزارییە بۆ دەوروبەرەکەت.. چونکە سوپاسکردن بەڵگەیە لەسەر وەفاداری.




ماڵو سامان هی ئەو کەسە نییە کە کۆی دەکاتەوە، بەڵکو هی ئەو کەسەیە کە تامو چێژی لێدەبینێت.



## ژیان فێری کردم

کاتێک مرۆڤ ماڵاوایی لە ژیان دەکات، هیچ شتێکی لە دونیادا بۆ نامێنێتـــەوە جگە لە کردەوەی چاکە، کەواتە چاکە بچێنە، دڵنیابە چاکە دەدوورێتەوە.

## ژیان فێری کردم

بە هەڵەکانت شـــەرمەزار مەبە، بەڵام ئەگەر هەمان هەڵەت دووبارە کردەوە شەرمەزاربەو لاقی ئەوەش لێ مەدە کە ئەوە قەدەرە..

## ژیان فێری کردم

ئەگـــەر هەنگاوێک بـــۆ دواوە گەڕایتەوە بێ هیـــوا مەبە، لە یادت نەچێت تیر پێویستە بیگێڕیتە دواوە، بۆئەوەی بە بەهێزی بەرەوپێشەوە بڕوات.

## ژیان فێری کردم

ســـەرکەوتن وەکو پەیژە وایە، ناتوانیت بەســـەریدا ســـەربکەویت کاتێک دەستەکانت لە نێو گیرفانتدا بێت.



## ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە


١- افكار من ذهب.

٢- هكذا علمتنى الحياة- دكتور(مصطفى السباعي).

٣- حكم واقوال في الحياة.

٤- ويكيبيديا، الموسوعة الحرة.

٥- http://www.startimes.com

٦- http://forum.sedty.com

٧- http://www.qwled.com

٨- http://www.ibtesamh.com

٩- http://www.ommahat.net

